

# لەتیف هەڵمەت

## دیوانی
# هەورو
## دوو[illegible]او دوونکردنی دەقەکان

یا سورەتە بزر بووەکانی:
لەتیف هەڵمەت

شیعر

**دیوانی**
**هەورو دووناو ڕوونکردنی دەقەکان**
**یا سورەتە بزر بووەکانی: لەتیف هەڵمەت**

**نووسەر: لەتیف هەڵمەت**

**بابەت : شیعر**

**دیزاینی بەرگ و ناوەوە : نومێد محەمەد**

**تایپ: بەیان محەمەد**

**تـــــــــیراژ: ٥٠٠ دانە**

**نرخ: ٥٠٠٠ دینار**

**چاپ: چاپخانەی کارۆ**

**لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان**
**ژمارەی سپاردنی ( ١٨٦٩ ) ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە**

((سەرجەمی ئەم شیعرانەم لە ساڵی ٢٠١٨- و - ٢٠١٩دا لە فەیسبوکەکەمدا بڵاوکردۆتەوەو لێرەدا دەستکاری هونەریی هەندێ لەشیعرەکانم کردووە)).





لەتیف هەڵمەت


# دیوانی
# هەورو دووناو دوونکردنی دەقەکان
# یا سورەتە بزر بووەکانی:
# لەتیف هەڵمەت

2019

**ئەم دیوانە پێشکەشە بە:**

ثریا شێخ عەلی شێخ محەمەد شێخ حەسەن کەسنەزانی ئامۆزام کەدەساڵی رەبەقە شێرپەنجە هەرەشەی لێدەکات‌و لەشیعر نووسین‌و خوێندنەوەی کات‌و ناکاتی من تورەو بێزار نابێ.

# شیعرێکی سۆفیگەری

من ئەو کۆترەم هەڵفڕم بۆ کوێ
تیری عەشقی خوا دڵم دەنەنگوێ

مەستم بەپێکی عەشقی خودایی
لێ ی نۆش دەکەم بە... دەموچاو و گوێ

بەجۆرێك مەستی عەشقی خودام من
گوڵ بانگ کەم لە سەر تاوێر دەپشکوێ

ئەگەر بمەوێ لەو لووتکە دوورە
بەردێك بدوێنم... یەکسەر دەبزوێ

ئاگر بەعەشقی رۆحم گڕ دەگرێ
گیا بەئەوینی دڵم دەعیشوێ

گومڕاو بەدمەستم بەعەشقی لەیلا
مەستی بەرم دات جەستەم دەپوێ

دڵم بتخانەی عەشقی لەیلایە
بەخەندەی لەیلا گوڵو گیا دەڕوێ

بڵندە ئاڵای عەشقی لەیلای من
شەو مانگو.... رۆژ خۆر لەژێریا دەنوێ

من سەودا سەری خەندەیە لەیلام
تۆ کۆیلەی پارەی بڕوی بۆ هەرکوێ

من لەیلام دەوێ نەك پلەو کورسی
جیاوازی زۆرە دورێکو چەوێ

ڕووناکی خودا لەدڵمایە من
سڵ ناکەم لەهیچ تاریکە شەوێ

(دینتان بۆخۆتان... دینی خۆم بۆ خۆم)
من سۆفیگەری بۆ دڵم دەلوێ

من گوێ لەهەموو دەنگەکان دەگرم
گوێم تەنها دەنگی لەیلا دەژنەوێ

جگە لەوشەی عەشق ڕۆژێ دێ
هەرچی وشەیە دەڕزێو دەپوێ

هەتاوی ئاسمان هەڵدێو دەومرێ
خۆری عەشقی من یەك سات ناڕەوێ

ئەوەی پێڕەوی عەشقی من نەکات
هەر سەرگەردانەو هەرگیز ناسرەوێ

چۆن ورگ پڕ دەکەن لەخۆراکی خۆش
بەپارووی زلو ملاکو ئەسکوێ

دڵیش وا پڕکەن لەعەشقی لەیلا
سەردەکەون لەگشت مەرجو دەوێ

ئەوەی لەیلایەك لەدڵیا نەبێ
هەر خۆڵەمێشی بەدبەختی دەجوێ

بەعەشقی لەیلا پێکەوە دەژین
گشت ئاینەکان... ئالێرەو لەوێ

عەشقم چرایە شەو ڕادەماڵێ
ڕێ کەس پڕ ناکا لەدەردۆنگو سوێ

برایەتی یە ئاڵای سۆفێکان
بێ برایەتی... ژیان دەسوێ

لە قەڵەمڕەوی عەشقم بەو لاوە
تاریك... تاریکە... گشت قەڵەمڕەوێ

عەشق رایهێنام بۆ ناو زامی کەس
نەبم بەژانو بەزووخاو...و سوێ

عەشق جیاوازی دینی نازانێ
(ئیقبال)و (غاندی) لێکتر ناکا جوێ

عاشق ئاژاوەی دینی ناگێڕێ
بەنووری لەیلا دڵی دەسرەوێ

سۆفی بێ باکە بەهەشتی بێ ... یا
گورزی ئاگری خوای تێبسرەوێ

ڕێگاکەی بەرەو ماڵی خوا دەچێ
گشت ئاینێکو هەموو مەزهەوێ

عەشقێکی وەهای خوام لەدڵدایە
بمەوێ بەرۆژ ئەستێرە دەڕوێ

واکەمەندکێشی عەشقی خودام من
ئەگەر بخوازم... شەوخۆر دەکەوێ

گەر هەموو دونیا تاریکایی بێ
دڵ ڕوونە عەشقی خوای تیا دەجڵوێ

پەراوێز:

١. ئیقبال= گەورەترین شاعیری پاکستانە.

٢. غاندی= گەورەترین کەسایەتی هیندستانە.

٣. لەیلا= سونبولی عەشقی عاشقانو سۆفیێکانە.

٤. مەزهەو= مەزهەب... لەعەرەبی یەوە کوردێنراوە.

٥. مڵاک= کەوچک= مراک.

٦. ئەسکوێ= کەوچێکێکی گەورەی قووڵە. شلەی پێ تێدەکرێو لەهەندێ ناوچەی گەرمیان پێی دەگوترێ چەمچە...

٧. چەو= زیخو چەو.

٨. دەجڵوێ = دەدرەوشێتەوە.

٩. دەعیشوێ= نازدەکات.

١٠. دەو= گرەو= پێشبڕکێ.

١١. دەوێ= پێشبڕکێ یەک= گرەوێک...

# عەشقێکی کلاسیکی

بەبێ عشقت یەك سانە لام... دەردۆنگیو شادیو... رۆژو شەو
بەبێ خەندەی لێوەکانت... چوونیەکن لام بێداریو خەو

مرواری.. بەبێ بەهایە بێ گەردنت... وەك پەڕی کەو
لەگەردنتا... وەکو یاقووت گرانبەهایە... زیخو چەو

ئەمن پیرە سۆفییەکی ناومالّی خانەقاو مزگەوت
عەشقت کەمەندکێشی کردم بۆ بتاخانەکەت بەرێکەوت

بۆ پشووی رۆح هاتوومە ناو حەرەمسەرای پەرستگاکەت
داستانی عەشقم دەنووسم لەبەر رووناکی چراکەت

من چیم داوە لە چیمەن‌و باخ‌و گوڵزاری رازاوە
دەروێشم‌و زەرگی گووپمە برژانگی تیژی ئەو چاوە

کچێ ئەوە باران نیە... خوێنی منە... من ... رژاوە
ئەی نابینی کەشمشێری ئەبرۆی تیژتم لەدڵ داوە

کچێ ئەوە گوڵەباخ‌و بەیبوون نیە کە رووابوە
گوڵی زامەکانی دڵمە لەبەر پێی تۆدا ژاکاوە

کچێ ئەمە وشە نیە کەدەیانکەم بە هۆنراوە
گەلای خۆزگەی پیرێتیمە عەشق داوێتێ دەم باوە

بتخانەکەت چۆڵ ناکەم‌و بۆ هیچ پەرستگایەك نارۆم
خودا لێرەدایەو منیش هەر لێرەدا دەبم بەمۆم

دەبەر لەوەی بەپەلکەزێرینەی پرچت بمدەی لەخاچ
جەستەم چڵکە سوێی گوناحە پاکم بکەرەوە بەماچ

# لەکام ئاسمانەوە دێی تۆ:

# هەتاوی عەشق

تەنها بتێکە... هەر تەنها بتێك
کەپەرستنی حەلاڵە... حەلاڵ یاری من

کەپێم گوت سنگت دەکەم بەبەرماڵ
گوتی پرچەکەم بکە بە بەرماڵ یاری من

کە گوتی چیای سنگم ئاگرە
گوتم با عەشقت بمکا بە زووخاڵ یاری من

پێم مەڵێ سۆفی تۆ لە عەشقت چی
نابینی عەشقت کردمی بەمنداڵ یاری من

سۆفیم... هەڵەتو پەڵەتم زۆرە
هەر بە عەشقی تۆ دەکەومە حاڵ یاری من

من باڵم نیە هەڵفڕم بۆ لات
عەشقت دەمداتێ سەدان هەزار باڵ یاری من

ئاوارەیەکی بێ خاکو مەرزم
پرچی تۆ بۆ خۆم دەکەم بەرەشماڵ یاری من

ئەگەر چی لەمن دووری وەکو مانگ
لەیەك هۆدەداین هەردەم بەخەیاڵ یاری من

خۆ دەمو لێوت بێ خەتو خاڵە
بالە سەر لێوتا ماچ بکەم بەخاڵ یاری من

پیری وا مووی سپی کردووە
بەلام عەشقم وەك سکڵ ئاڵە ئاڵ یاری من

بالێوت بەماچ گوناحبار بکەم
بۆ گوناح هەردەم دەکەم گڕوگاڵ یاری من

سەرم سوڕماوە کەوانی ئەبرۆت
چۆن واکێشراوە... چۆن بەبێ پڕگاڵ یاری من

نەمدەزانی بۆ شپرزەم... تومەز
من بەدوای تۆدا وێڵم و عەوداڵ یاری من

تۆ لەوەرزێکی زۆر جیاواز دەچی
نەهەورو تەمی نەڕوونو ساماڵ یاری من

ئەوەندە ئاشنای رۆحتم هەر دەڵێ ی
هەردوو سەد ساڵە هاوماڵێن هاوماڵ یاری من

کەحاڵی عەشق تەواو بمگرێ
بترسە لێوت بخۆم بەقەپاڵ یاری من

خۆم پیری چرکە... چرکە... دەمدزێ
دڵم هەر گەنجە دوای هەزاران ساڵ یاری من

بەبێ عەشقی تۆ دڵم دڵ نیە...
بێ عەشقت دونیا... بەتاڵە بەتاڵ یاری من

# پڕووشەی شیعرە دوورەکان

بەفر چین چین دەبارێ
خەم لەدەنکە گەنمێك دەخوات
کەبەفر دایپۆشی:
چۆلەکەیەك

ڕەنگە عاشقی ماسییەك بوو بێ
ئەگینا بۆ هەموو شەوێ
لەدەریاکاندا دەنوێ:
مانگ

ئەمشەو زۆر تووڕە بوو
مانگو ئەستێرەکانی
فووت دا،
هەور

هەزار ساڵە لەپشت ئەو گوندەوە
راوەستاوە
چاوەڕوانی چ کچێك دەکات ئەو،
چیایە...

عاشقە
لەو ئاسمانەبڵندەوە
بۆ باوەشی گوڵ
خۆی
هـ
ە
ل
د
ە
د
ا
ت
ە

خ

و

ا

ر

ه

و

ه

ئاونگ...

جادوو بازن

جارجار دەبن

بەشەمەندەفەر

جارجار بەکەروێشك

جارجار بەمەڕو بەرخۆڵە؛

هەورەکان

ڕەشەباش دەستی هەیە

ئەوە نیە لەبەردەم دادگای کۆنی سلێمانی دا

مەمکدان دەدزێو

پەنجە دەسووێ لەتەنوورەی:

ژنان

لەتۆوە فێر بووە

پرچی خۆی ڕەش ڕەش بکات:

شەو...

ئاگاداری عەشقی دڵی پەپوولە نیەو

بێ باکە لەوەی

کەخۆی دەسوتێنێ:

چرا...

دار سنۆبەرەکە خەمبارە

چونکو جل و بەرگی دارتووەکەی هاوڕێی

دزی دوێنێ ئێوارە:

ڕەشەبا...

ئەوە بەدوای چیدا.. چی

کۆڵان

بەکۆڵان

رادەکەن بەپێی پەتی

ڕەشەباکانی:

سلێمانی

بەسەر لقی دارێکەوە
سەما دەکات
وادەزانێ هەموو دارەکان
بۆ سەمای ئەو رووا‌ون؛
چۆلەکەیەک...

ئەم بەیانی یە
گەڵایەکی وەریوم بینی
رەنگە ئێستا گەڵاکەش بڵێ؛
ئەم بەیانی یە چاوم کەوت بە؛
شاعیرێک...

تەماشای چراخانی ماڵی ئەستێرەکان
بکەن
ئەرێ ئەو چرایانە
بەنەوت هەڵدەبن
یا
بەکارەبا...

# مشتومڕێکی یەك لایەنی

من خودام
وننەکردووە

خودا منی
ونکردووە

شەیتان
منی وننەکردووە

من شەیتانم
ونکردووە...

* * *



هەمیشە سێبەری دونیا
خودامان
لێ ون دەکا...

ئەو کاتە
تۆ نیت
**کە** من...
**من** نیم...

# درێژترین رێگا

ئەم رێگایە
جێ پێی پیاسەی منوتۆ
بست بست درووستی کردووەو
لێرەوە... دەگاتە
ئەو پەڕی ئەم دونیایە
ئەم رێگایە
لە ژێر پێماندا نیە
لەئەتڵەسی دڵماندایە
ئەم رێگایە
هەور زستان... پیاسەی بەسەردا دەکات
شووشە عەتری پیا دەڕژێنێ

هەتاویش دێ شەتڵی گوڵی تیا دەچێنێ
ئەم ڕێگایە
لەدڵمەوە دەست پێدەکا
لەدڵتا کۆتایی دێ
ئەم ڕێگایە
لەدڵتەوە سەرهەڵدەدات
لەدڵمدا لەنگەر دەگرێ...
ئەم ڕێگایە
درێژترین شەمەندەفەری دونیایە...

## کەپر

نیشتمانیان
لێ کردوین بەزیندان
حزبەکان
تابەزیندوێتی نەمرین
خەوبەکەپرێکەوە دەبینین
لەهەندەران

***

# سێبەر

جار جار نازانم لەکوێ
لێرە... لەوێ
تووشی سێبەرێك دەبین
رەنگە
منداڵێتیمان بێ

# دروستکردنی

# وێنەی کاریکاتێری بەوشە

تەلەفزیۆنم کردەوە

مناڵەکانی کرماشان

بەدیار تەرمی دایکیانەوە

گوڵی فرمێسکیان دەباران

وەکو ئەوان

چاوەکانم پڕ بوون لەپشکۆی گریان

*** ***

جارێکی دی تەلەفزیۆنم داگیرسان
هەموو ڤاڤا پێدەکەنین
دەمیان پڕ بوو لەددانی ئاسنین
سەرکردە کاغەزینەکان
چی رووی دابوو... چی نازانم
لەبینینیان وەها بێزار بوو چاوانم
بەمشت شاشەی تەلەفزیۆنەکەم شکان
تا ئێستاش خوێن دەچۆڕێ لەپەنجەکانم

# تابلۆ
# بەوشە کێشراوەکان

جاران جانتاکانمان
دەیانبردین
بۆ لای یار

ئێستا جانتاکانمان
دەمانبەن بۆ
قووڵایی دەریاچەی ئیجەو
تاراوگەیەکی نادیار

جاران
مردوومان
دەسپارد بەخاکی نیشتمان
ئێستا تەرمی خۆشەویستەکانمان
دەسپێرین بەدەریای ئیجە...

منداڵەکە وەك هەموو منداڵێکی کورد
هێندە تەرمو گۆڕی دیبوو لەم دوند... لەو گوند
کەفێری وێنەکێشان بوو
تەنها وێنەی گۆڕی
درووستدەکرد...

جاری جاران
بەباخچە دەڕازایەوە
نێوانی گشت گەڕەکەکان
ئێستا بەخەمو گۆڕستان

کەیەکێك شەهید دەبێ خوا لە ئاسمان
یەکەمین کەسە بۆی دەگری
ئەی ئەگەر شەونمو باران
فرمێسکی خودا نین
ئیتر چین...!
* * *
پاڵەوانەکە سەهۆڵ بوو
کەهەتاو هەڵهات
چیرۆکەکە کۆتایی هات

تاوانی چیە.. چی ئاخر
لەقەفەزی دڵەوە
دەیگوازینەوە ... لەپڕ
بۆناو
زیندانی کاغەز...!
شیعر...

# داربڕ

داربڕێ بەرەبەیانێك
گەیشتە ناو  دارستانێك
دارستان
کەتەور بەدەستی بینی
دارەکانی کۆکردەوەو فڕی و فڕی
بۆ ئەو پەڕی
هەزار ئاسمان
نەوەك داربڕ دارەکانی
بکات بەکورسی پەرلەمان

# نیشتمان
# لەجانتای ئاوارەکاندایە

ئەو هەموو جانتایانەی
بەرەو دەریاچەی ئیجە دەڕۆن
پڕاوپڕن لەنیشتمان

ئەو هەموو دڵانەی
لەئیجەدا سەرنگوون دەبن
لێوانلێون لەیار

ئەو هەمو ڕۆحانەی
لەتاراوگەکاندا خامۆش دەبن
سیخناخ سیخناخن
لەخودا

ئەوان

نیشتمانو

یارو

خودایان برد

ئیتر ئێمە

لێرە چبکەین چی

بەتەنیا...

## لەبارچوون

منداڵ لەبار دەچێ

شۆڕشو

شیعریش

# پۆلێك شیعر لەشێوەی دەفرە فڕیوەکان

ئەو هەورەی کە دەشکێنێ تینوێتی
دارێك
هەمان هەورە... کەوێران دەکات
شارێك

ئاگاداربن
هەمیشە پڕاوپڕە.. لە:
شڕەخۆر
شەمەندەفەری

شۆڕشگێڕان
کەدڵۆپێك نەوت
لەدایك دەبێ

گۆڕێك زیاد... دەكاو
گوڵێك دەومرێ...
شەقامەكان

پێلاوەكانمان دەخۆن
چركەكان
كاتەكانمان
دەدزن

پێلاو كەتەنگ بوو
بەپێت
لەشەقامێكدا
جێی دێڵی
هەروەها
نیشتمانیش

بەهەشت بوونی نەبوو... و نەبوو
كەدایكم مرد
خوا بەهەشتی بۆ دروستكرد

كەمەرگ رۆحی ئەو منداڵەی
بۆخۆی برد
لەبرسێتیو

ژیانی ژیر کەپری نایلۆن
رزگاری کرد...

محەمەد دوایین پێغەمبەرە
عەلی دوایین خەلیفە
من دوایین ئیمبراتۆری شیعر...

.

کە تفەنگەکان بێ دەنگ بوون
شیعری من بوو... من هاتە دەنگ
سەری بەرزی نەوی نەکرد
بۆ زەبرو زەنگ
لەرووی داگیرکەراندا
بوو بەمینو بۆمباو تفەنگ

شەرە پەرۆی حزبەکان
زۆر شتیان بۆ دابین کردین
ئاوارەیی لەولاتان
گەلەگۆڕی بێ ناونیشان
خێومتی نایلۆنی جوان... جوان
دەستو قاچ و چاوی دەستکرد
پەنابردن بۆ دوژمنان
گۆڕستانی ناخی دەریاو
ناوبیابان
بێزار بوونو بێزکردنەوە
لەبۆنی خاکو نیشتمان...

# پاسەوانێکی گومناو

که ئێمه لەماڵ نابین
سەرانسەری ماڵەکانمان
داگیر دەکات
بەڵام نه ئاو
بەفیڕۆ دەدات
نه کارەبا
نەفرێزەرەکانمان
دەکاتەوە
نەکانتۆرەکانمان
دەپشکنێ
نەسەیری ئەلبوومەکانمان
دەکات

نە نامە نهێنییەکانمان
دەخوێنێتەوە
نە ژوورەکانمان
بەدوو کەڵی جگەرەو درۆ
سواغ دەدات
بەپێوە رادەوەستێو
هەتاکو دەگەڕێینەوە
پاسەوانێتی ماڵەکانمان
دەکات
بێ دەنگی...

# راو

**جار جار لەخەومدا بەتفەنگێك**

**راو دەكەم**

**فەرهەنگێك...**

# پەپوولە ئەلەکترۆنی یەکان

گوێ لەهەموو گۆرانییەك
ناگرم
بەڵام هیچ گۆرانییەکم
لەلا حەرام نیە

هەموو کتێبێك ناخوێنمەوە
بەڵام هیچ کتێبێکم
لەلا قەدەغە نیە

ئەگەر... ئەحمەدی خانی دەبووم من
چۆن دەمهێشت
مەم‌و زین
بۆ یەکدی نەبن...

لێکدەچن
لەدایکبوونی کۆرپەیەك‌و
شکۆفەکردنی
گەڵایەك

من دەڵێم:
دوای بەخاك سپاردنیان
دەفڕن بۆ ناو
یەکێك لەئەستێرەکان... مردۆکان
ئەگینا
ئەم هەموو ئەستێرە زەبەلاحەی
بۆچی دروستکردووە... خوا

ئەگەر باسی:
گەورەیی
خوداو

چرای وشەکانی
بکەم
هەموو
پێشکەوتنخوازەکان...
دەڵێن:
لەرەوتی نوێخوازیو یاخیبوونو
دژە باوی لای داوە

ئەگەر باسی:
چەوسانەوەی چینایەتیو
زەبرو زەنگی سیستەمە ئیسلامییەکان
بکەم
مامۆستای مزگەوتی گەڕەکەکەمان
بەکۆمۆنیست بوون
گومڕام دەکات

ئەگەر باسی:
ئازادی تاکە کەس بکەم
سەرۆکی لیژنەی فتوا
بەسارتەرگەری
ناو زەدم دەکات

# بۆ بەرز بفڕە

هەمیشە لەئاسمانەکاندا
بۆ بەرز... بەرز.. بەرز
هەڵفڕە
بەڵام لەیادت بێ
تۆ خەڵکی زەویت

# بڕێك لەخەونە ونبۆكانی مەلا نەسرەدین

بە شەپۆل پەیتا پەیتا
شیعری كۆچەری
دەنووسێ... لەدەفتەرەكەیدا
دەریا

تاجێكی زێڕینە
ڕۆژێ لەناكاو
لەئاسمانی دەدزم
بۆخۆم
هەتاو...

سەیر نەبێ لەلات
ئەگەر رۆژێك
تەرمی هەزاران بیرەوەری
کەسانی نەناسراوو
ناسراو
لە
ئاوێنەیەکی...
ناو
مەزاتخانەیەکی... تاریکدا
بدۆزیتەوە
لەناکاو...

سەیر نەبێ لات
شەوێك
لەپێو پێڵاوی مرۆڤو
تایەی ئۆتۆمبێلەکانو
سێبەری ئەپارتمانەکانو
زبڵو
خاشاکو
ئاغزە جگەرەو
بەرماوە جۆر بەجۆرەکان
بێزار ببنو
بفرن بۆ ئاسمان
شەقامەکان...

هەمیشە و هەمیشە شیعرێکی
سپی سپی
بەفرمێسك لەسەر لووتکەکان
دەنووسێ زستان

چەند جادوبازە
وشەی شاعیرەکان
دەدزێ و زۆرجار
دەیکات بەگوڵ،
بۆ عاشقەکان
بەهار...

ورچێکی راوکرد بەتەڵە
راوچی یەك
چەند وشەیەك بەقەڵەم
شاعیرێك

جاران
خەڵك لەمردن دەترسان
ئێستا لەژیان

خودا
منی دروستکرد
منیش
خودا...

# وڕێنەی خەوتوویەکی بێدار

## شیعرێکی کاریکاتێری

هەندێ بەرپرس
تابلۆگەلێکی سوریالین
کەدەدەنە
قاقاو تریقەی پێکەنین
خوێن لەدەمیان دەبارێ
گەرچی هێشتا کەس نەیدیون
بگرین.. جارێ
بەڵام دەڵێن؛ ئەگەر بگرین
نەوتو بەنزین
خوڕ خوڕ وەکو ڕووبارێ
لەچاویان دەڕژێتە خوارێ

# جێڕنیکای

# سەدەی بیستو یەك

لەخەونمدا بیکاسۆم دی

لەگلگۆکەی خۆی دەرچوو

سیپاڵێکی

ڕەش... ڕەش... ڕەشی

لەبەردابوو

بەهەزاران شاباڵ فڕی

بۆ خورماتوو

زام بەزامو ... سووتوو.... سووتووی

کارەساتی دووزخورماتووی

بەفرمێسکی خوێناوی

هەردوو چاوی

نەخشاند لەسەر تابلۆیەك

تابلۆکە سوور بوو لەخوێنا

ناوی لێنا

جێڕنیکای سەدەی بیستو یەك

# لاوانەوەی زیندۆکان

ئەو منداڵە.. لەگوندێکی کرماشان

دایکێکو... دوو

کۆتری بوو

دایکەکە، بەیانیان

نیوەڕوان

ئێواران

بەرپێی هەردوو کۆترەکەو

کۆشی تاقە منداڵەکەی پڕ پڕ.. دەکرد

لە ئاو و نان

دەستی بوومەلەرزەیەك

دایکی منداڵەکەی فڕان

لەو ساتەوە.. هەتا ئێستا

منداڵەکەو

دوو کۆترەکە

نە ئاویان بینیوە.. نەنان...

# درۆی رازاوە

- تەلەفزیۆن بۆچی باشە

+ پیشاندانی بەرپرسەکان

- بەرپرسەکان بۆچی باشن

+ هەڵڕشتنی درۆی جوان.. جوان...

- ئێ جا درۆ بۆچی باشە

+ پینەو پەڕۆی کورسێکانی پەرلەمانو

ئەنجومەنی وەزیران...

# کاریکاتێر

پۆست بەشکرا

فلان دانرا

بەوەزیری مەرزەکان

فیسار نێردرا

بۆ پەیوەندێکانی تاران

فلانیان کرد بەئەندامی پەرلەمان

فیسار دانرا

بە بەڕێوەبەری دارستان

فلآنیان کرد بە باڵیۆز لەهیندستان

فیسار کرا

بەپارێزگار

فلآن بەقایمقامی شار

فلآنیش هەر لەناکاو

بوو بەبەرپرسی نەوتو ئاو

هەرچی پۆستە بەم و بەو پڕکرایەوە

هیچ پۆستێکی گەورەو بچووك نەمایەوە

لەپڕ فلآن

کەوتە بۆڵەو پەنجەی راستی ڕاوەشان

بەرپرسەکان

هەموو ترسان

بەرپرسێکی گەورە گەورە پێیگوت قوربان

ئێمە چۆن تۆ.. لەیاد دەکەین ئەی هاوڕێ گیان

تۆ دانراوی بەبەرپرسی هەمووسەرە نوێلکەکان

ئیتر فلآن

کەوتە خەندەو خۆهەڵکێشان

چونکە بووە بەبەرپرسی هەموو سەرە نوێلکەکان

# شەڕە کورسی

کورسییەکی سێ قاچم دی

لەناو هەڕاجخانەیەکدا

تووڕ درابوو

کورسییەکی پەرلەمان بوو

قاچێکی

لە شەڕە پەڕۆدا شکابوو

* * *

# ونکردن

کەرێگایەك وندەکەین... زۆرجار

رێگایەکی دی کوتوپڕ

دەماندۆزێتەوەو دەمانبات وەك

لافاوێکی خوڕو چڕ

بۆ شوێنێکی دیارو نادیار

# یەك دەنگ - یەك كەس

یەك دەنگ
هەر یەك دەنگ
باسی ئازادی بكات
بەهێزترە لەهەزاران تۆپو تفەنگ

یەك كەس
هەریەك كەس
دەربارەی ئازادی بدوێ
نایەڵێ هیچ دكتاتۆرێ
بەئاسوودەیی بنوێ

# دوو وێنەی دژیەك

نەبا فیشەکی وێڵی

شەڕی برا کوژی بتپێکێ

لەسەر لقی هیچ درەختێك

هەڵناکۆڵم

وێنەکەت

* * *

هەر بەڕێکەوت

بەرپرسێ پێی هەڵخزاو

بەسەر هەندێ شووشەدا کەوت

هەزاران کەس سوێند دەخۆن سوێن

چۆڕاوگەی نەوت

لەبرینەکانی دەرژێن

لەبری خوێن...

# درووستکردنی
# گوڵ بە وشە

ژنانی دیکە بەزێڕەوە دەنازن
بەوەوە دەنازێ
کەلە گەردنی تۆدایە
زێڕ

ئەرێ ئەم هەموو
ماچەی
لەکوێ بوو
دەم

لەدەستنووسێكی كۆندا
خوێندوومەتەوە
سۆمەری یەكان بەهەنگوینیان گوتووە
ماچ...

تا ئەو كاتەی دەگاتە بەرماڵی خودا
تەنیایە هەموو
مرۆڤێك

جگەرەیەكو
دارستانێك
بەدەنكە شقارتەیەك
گڕ دەگرن.

گوڵ لەزەویدا دەچێنیٚ
خودا...
مین لەژێر گوڵدا دەشارێتەوە
ئەمەریكا...

بەفری سپی سپی دەبارێنیٚ
خودا...
سوور سووری دەكات ئەمەریكا
بەخوێن

خوێندنەوەی هەزاران
رۆمانی شاکارو
هەزاران هەزار شیعری دڵداری
بەتام‌و چێژ نین
وەکو یەکەم
ماچ

ئەگەر دەوڵەمەندێتی
بەپارە زۆری بێ
گەلێ سۆزانی و نیشتمان فرۆش
دەوڵەمەندن...

بەهارە ئەی شنەبا
پێت پەتیکە
رقی لە پێڵاوە
گوڵ

مەلێ رەشەباکان بۆ وا توورەن
ئەوە خودایە لەرەشەباکاندا
نزاکانمان
کۆدەکاتەوە...

خودایا
بێزاربووم لەهاوڕێتی مرۆڤ
بمکەی بەهاوڕێی
پەپوولە...

ئەمانە
براو خوشکەکانی خۆیان
بۆیەك کورسی دەکوژن
هەر هەموو کورسێکان وازلێدێنم
بۆیەك زمردەخەنەی تۆ:
من

# یاری کردن بەوشە

هەر لەداری یەك دارستان
دروستدەگرێ ... یەك دارستان
کورسی ژێر پەتی سێدارەو
کورسی هۆڵی پەرلەمان

کورسی حەزی لە یاری یە
وابووە لە دێر زەمانەوە
جارە جارە
لەهۆڵی پەرلەمانەوە
جارە جارە
دەتبات بۆ پەتی سێدارە

## سوێند

سوێندم خواردووه
دەم نانێمە ناو دەمی هیچ کچێکەوە
بەبێ:
دەستنوێژ

لە دەستم رادەکات
وەکو ترپەی پێی شنەبا
کات...

بۆ کوێ بڕۆین.. هەموو کاتێک
وەکو تەڵە دەمانگرێ
جوانی:
کچێک

# مەترسێکان

نیشتمان
لەمەترسیدایە
مەترسی

پاشەڕۆژمان
لەمەترسیدایە
مەترسی

گڵکۆی شەهیدەکانمان
لەمەترسیدایە
مەترسی
دین‌و ئیمان
لەمەترسیدایە
مەترسی



گەمارۆی داوین مەترسی...
کام رەنگە زۆر دڵسۆزە
کام دەنگە زۆر دڵسۆزە
سەد شەڕی کورد قڕان دەکات
بۆیەك کورسی...

# یاری کردن بەژمارەکان

چۆلەکەیەک
گوڵە گەنمێک

چۆلەکەیەک
گوڵەگەنمێک

چۆلەکەیەک
گوڵەگەمێک

هەمووی دەکات، سێ چۆلەکە
چونکە چۆلەکەکان گوڵەگەنمەکانیان
خوارد
* * *

بەرپرسێك: سێ دەریای نەوت
بەرپرسێك: سێ دەریای نەوت
بەرپرسێك: سێ دەریای نەوت

هەمووی دەكات: سێ بەرپرس
چونكە بەرپرسەكان
دەریا نەوتەكانیان
لووش كرد...

# راوکردنی
# ئەستێرە بەقەڵەم

نزیکترین ڕێگای نێوانی دڵەکانە
بەڵام
بەهەموو کەسێك دروستناکرێ پردی:
وشە

نەرمترینو بەهێزترین چەکە
ئەگەر پڕی بکەین
لەوشەی جوان...
قەڵەم

جوانترین رووبەرە بۆ دروستکردنی
گەورەترین باخچە
بەوشە
کاغەز

باخچەکانمانی پەژموردە کرد
شەڕی ڕەنگەکان بۆ
کورسی...

دەبا باخچەکان دروستبکەینەوە
بۆ پەپوولەو منداڵەکان
بەوشە...

شەوێ ئەوەندە گریا
هێندە ڕۆندکی باران
دەسکە گوڵی بەدەزووی ڕەنگاوڕەنگ چنراوی
سەربەرگی سەرینەکەی... بوو
بەدەسکێ گوڵەباخ
عاشقێك....

دەگرێ بەسەرینو دۆشەکی
بووكو زاواو
بەتاجی سەر سەری مەمكو
گۆرەوی پێی کچۆڵەو
بووکەواڵای منداڵانو
کفنی مردوو:
پەموو

خۆشی تیادا نەماوە نیشتمان
ڕۆژێ دەڕۆم بە سیخە
نەختێ شادی ساختەو پێکەنینی دەستکرد
مارە دەکەم لە : ئێران...

# چیرۆکێك
# لەچیرۆکەکانی نەوت

خواناسێكو
جووتیارێكو
بەرپرسێکی نەخوێندەوار
لە قوتابخانەیە تەوزیمی
فێری خوێندەواری بوون
رۆژی نمرە وەرگرتن
مامۆستاکەیان پێی گوتن
هەریەکەتان
کام پەیڤەتان
زۆر لاجوانە
لەسەر تەختە ڕەشەی پۆلەکە بینووسن

خواناسەکە نووسی : مزگەوت
جووتیارەکە نووسی: خەرمان
بەرپرسەکە نووسی: نەوت
پانتایی تەختە رەشەکەی
لەلا بوو بەدەریایە نەوت
لەخۆشیدا بوورایەوەو
کوتوپڕ کەوت
لە گوێی دەریا نەوتەکەدا
خەوتو خەوتو
خەوتو
خەوت

# هاوڕێ

بەلای ماڵی باخەوانێکدا تێپەڕیم
بۆنی گوڵ دەهات
گوڵەکانم ئاودا
بەفرمێسک

بەلای ماڵی شاعیرێکدا گوزەرم کرد
بۆنی وشەی جوان دەهات
وشەکانم کرد
بەگۆرانی

بەلای ماڵی بەرپرسێکدا هەنگاوم نا
کاسی کردم بۆنی
نەوت

نەفرەتم لەنەوت کردو
زەویم پڕ کرد لەفرمێسك و لەگوڵو
لەوشەی جوان
هەموو باڵدارەکانو
عاشقەکان
بوون
بەهاوڕێم...

# گریمانەکان

ئەگەر ئەم جارە بێتەوە

ڕۆمانێکی دیکە بەناونیشانی؛

(سڵاو لەچەك)

دەنووسێ؛

هەمەنگوای...

ئەگەر بۆی بلوێو بێتەوە

پاژێکی دیکە بەناونیشانی : تاراوگە

بۆ (کۆمیدیای خوداوەندێتی) دەنووسێ:

دانتی...

ئەگەر بیزانیبایە
ئەوەندەم خۆشدەوێ
هەتا هەتایە
نەدەمرد؛
دایکم...

خەو بەوەوە دەبینم سەرگەردان بەو ئاوارە
بۆ نیشتمانێك بگەڕێم
نەنەوتی تیابێ
نەپارە...

ئاشتیخوازەو میهرەبان
وشەی نارد بۆ پێغەمبەران
نەك شمشێری پۆڵاو ئاسن
خودای مەزن

نەمدەزانی گوڵ چۆن دەپشکوێ
تا پێنەکەنی:
دەمت...

من وەکو خوا
نیو بەشی کوڕ بە کچ نادەم
بەزیندوێتی هەموو دڵم
لەیەك کچێك تاپۆ دەکەم

ترووسکەی هەموو
چرایەکی دوور لەسەر گشت کەژێ
بۆنو بەرامەی چرای ژوور سەری
یاری لێ دەرژێ

# شکاندنی
# چوارچێوە نەشکاوەکان

درۆ دەکەی نەمگوتووە

پرچت چەندێ درێژە

قسەی وا هەر

دەرنەچووە لەدەمم

هەر گوتوومە پرچەکەی تۆ

د

ر

ێ

ژ

ت

ر

ە

لە

ز

ێ

ی

خەمم

دەتوانم چل ڕۆژی تەواو

مان لەخەوو نووسین بگرم

دەتوانم چل رۆژی تەواو

مان لەپێکەنین بگرم

دەتوانم چل رۆژی تەواو

مان لەقسە کردن بگرم...

بەڵام ناتوانم یەك چرکە

مان لەیادی ژن بگرم...

* * *

پایزیش بێ

سیخناخ دەبێ

لەگوڵی جوان ناوژوورو بەر پەنجەرەکەم

هەرچی شەوێ

کەدەنگی تۆ هەڵبقوڵێ

لە ژمارەی ڤایبەرەکەم

درۆ دەکەی نەمگوتووە

تۆم خۆشدەوێ

هەر گوتوومە ئەم ئەشقەی تۆ

من دەکوژێ بمەوێتو نەمەوێ...

بەم هاوینە سەرمایانە... بۆ نازانم...

دایانپۆشە بەپرچەکەت:

وشەکانم

درۆ دەکەی ئەم گوتووە

کەیادت کەم چاوم پڕ دەبێ لەگریان

هەر گوتوومە

فرمێسکی چاوی منەو

بۆتۆ دەرژێو

ناویان لێ ناوە؛

باران...

مەرەکەبم نەماوە... شیعرێکی پێبنووسم
دەربارەی دڵێك... شکانت
بەقەرز دوو دڵۆپم بەرێ
لەو دوو دەریا مەرەکەبە رەش... رەشەی
چاوەکانت

ناوێرم زۆر
سەیری هاوسەرەکەم بکەم
دەترسم تۆ... ببینێ
لەناو گۆشەیەکی
دیدەم...

ئەگەر دەم هەر نەشبوایە
بۆ ئەوەی ماچی تۆی پێ بکەم
هەر دە پەنجەم
دەکرد بەدەم

شاعیر نەبووم... کەپرچی تۆم هۆنییەوەو
بە بڵێسەی ئاگری عەشقم بۆتم بەست
ئیتر بووم بەدەریای هەڵبەست

ئاگاداربە سیخوڕەکان
لەبازگەکانی سنووردا
لەدڵتدا نەمبینن
شاعیرێکی یاخی و بێ ناسنامەم من
* * *
بزانە چەند نەرمو نۆڵو
خاوی دەکات... وەك پەلکەزێڕینەی ئاسۆ
یەك جار تاقیبکەرەوە
تەنیا یەك جار
پرچت بەماچی من بشۆ...

کەچپەی بارانی دەنگتم دەگاتە گوێ
ئینجانە بەتاڵەکانی دڵم پڕپڕ دەبێ
لە گوڵی نوێ...

بەهەموو دەستەکانی
ژمارەکانی خۆی دەژمێری... بەبێ چاودێر
کاتژمێر

بەهەموو زمانەکانی
باسی جوانی
جەستەی تۆ دەکات.. تا مردن

من...
ماج هەر نەبوو
نەیاندەزانی ماج چیە
بوونەوەرەکانی گەردوون
کەمن دەمی تۆم ماج کرد
عاشقەکانی گێتی. پۆل پۆل ... جوون جوون
لەمنەوە فێری ماج بوون

سەرو ریشو سمێلم
گڕی سپێتی... گرتووە...
با پێت نەڵێن چۆن کەمەندکیشی کردووە
عەشقو خولیای ئەو شاعیرە
پیرەمێردە
مووەکانم بۆیە بکە...
بەیەك خەندە....

## نمە بارانەکانی

## وەرزی هاوین

لەو ساوە تۆ خۆشتویستووم
هەرچەند دەدوێم
ناوت لەدەمما دەپشکوێ
لەوساوە تۆ... دڵت لەباوەش گرتووم
هەنگاو لەکوێدا دابنێم
گوڵی هۆنراوە دەڕوێ
لەو ساوە تۆ ماچت کردووم
خۆر لەسەر لێوم دەنوێ

* * *

هەزاران جار بەڵێن دەدەم
من بەتەنها بۆ...
کورسی باوەشی تۆ
خۆم کاندید دەکەم...

چونکە من تۆم خۆشدەوێ
بەشەو هەتاو
لەبەر پەنجەرەکەم دەخەوێ
چونکە من تۆم خۆشدەوێ
پەپوولە دێن بۆ ژوورەکەم
لەگەڵ سەدان ئەستێرەی نوێ

# ملوانکەی وشە ناتەباکان

ئەگەر لەجەنگی دووەمی جیهانیدا
سەربکەوتایە
هەزاران مێژوو نووسی هەلپەرست
ستایشیان دەکردو
هەزاران هونەرمەندی مەراییباز
پەیکەریان لەزێڕ بۆ بەرجەستە دەکردو
لەشیعری هەزاران شاعیری بێ باردا
دەبوو بەسومبلی ئاشتیو سەرکەوتن
هیتلەر

تاریکایی و هەتاو
چوونیەکن بەبێ:
چاو
گفەی رەشەباو
چریکەی دەنگی
سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی
چوونیەکن
بەبێ:
گوێ

ژەهری مارو
هەناری باخی میر
چوونیەکن
بەبێ:
زمان

بۆیە وا زەرد هەڵگەڕاوە
هەمیشە هەست بەتەنیایی دەکات:
هەتاو
ئێمە بەچاو دڵداری دەکەین
نابیناکان بە:
دڵ

کەدوای زەردەپەڕ ئاسمان چۆڵ دەکات
دێت بۆ زەوی‌و
دەبێت بەپرچی کچێك:
هەتاو

کەبەهار دەمرێ
لەپرسەکەیدا هەموو خشڵە زێڕەکانی خۆی
تووڕ دەداتە بەر پێی درەختەکان:
پایز

کەتۆ پێدەکەنی گوڵ شەپۆل دەدات
بۆیە ئابلۆقەت دەدەن:
پەپوولە

گورزەیەك لەو پرچەتم بدەرێ
بالەشەوی ژوورەكەمدا بیكەم بە:
هەتاو

هەردوكمان شاعیرین هاورێ
جیاوازیمان ئەوەیە
تۆ شیعر پێشكەش دەكەی
بەزۆردارەكان
من بەهەژارەكان
* * *
هەردوكمان شاعیرین هاورێ
جیاوازی نێوانمان ئەوەیە
تۆ شیعر بۆ شەڕ دەنووسی
من بۆ:
ئاشتی

هەردوكمان شاعیرین هاورێ
جیاوازی منو تۆ ئەوەیە
من بۆ وشە
دەسوتێم وەكو پشكۆ
هەر... هەڵپەی
كورسی دەكەی:
تۆ

منم منم...
بڵندترین کێو
ناودەنێم:
دایکم

کێ بەتافگە دەڵێ... چ نازدارێ
لەو بەرزاییەوە... هەموو جارێ
خۆی هەڵداتە خوارێ
کێ بەدڵمی گوت... کێ ...
بەتەنها هەر تۆی خۆشبوێ...

هەرگیز من تەنیانیم
لەهەر کوێ بم
وێنەیەکی تۆ بەوشە دەکێشمو
دەبێ بە:
هاوڕێم

لافاوی تووڕەی هەیە
باران...
عشق هەزاران ئاگردان

کە مرۆڤم لەیەك کاتدا
هەم گومڕامو
هەم خوا پەرست

لەنێوانی زەوی‌و ئاسماندا
جیهانێك درووستدەكەم
بەوشە
بشێ بیدۆزێتەوە: خەم

كەس نازانێ بەدوای چیدا وێڵە
وا هەر رادەكات شارەو شار
چركەیەك پشوو نادات:
رووبار

كەیەكەم ماچت دامێ
هەڵوەری
هـ
ە
ڵ
و
ە
ر
ی
منداڵێتیم

لەوەتی دونیا دونیایە
رقی لەگوڵ‌و گەڵایە:
رەشەبا

دوو شت زۆر زۆر
لێکدی دەچن
بەفرو
کفن

زەوی گۆڕستانی گوڵە
کاغەز گۆڕستانی:
وشە

ئاسمان
کارگەی ئەستێرەیە
کارگەی خەونو پەنجەرەیە
دڵم

دوو شت لێکدی
هەراسن... هەراس
درەختو:
تەوراس

سەرنج بدەن بەچاوی دڵ
لەژێر بەفری زستاندا
یاری دەکەن... هەزار هەزار
بەچکە گوڵ

لەمرۆڤەوە
فێری داونانەوەو
راوکردن بووە:
جاڵجاڵۆکە

هەمیشە رقی
لەچرایە:
تاریکایی

وای بۆ دەچم لەترسی مرۆڤ
خۆی خزاندۆتە ناو قۆزاخەیەکەوەو
لەبنی دەریادا خۆی شاردۆتەوە:
مرواری

دیکتاتۆرێکی جیهانی یە
بەهاری بۆخۆی داگیر کردووە:
چاوت

دەڵێی ژێی هەزاران
داوو تەڵەیە
تاریکایی هەموو شەوەکانی
بۆخۆی راوکردووە:
پرچت

لەدەرەوە
هەر راکەراکێتیو دەگەڕێ
چی لێ ون بووە:
رەشەبا

چاوچنۆك نیەو
وەکو وەزیری ناوئەنجومەنی وەزیران
بەجانتا دۆلار وەرناگرێ
وەزیری:
شەترەنج

لەپارە کۆکردنەوەی
بەرپرسە کوردەکانەوە
فێری کۆکردنەوەی
گەنمو دانەوێڵە بووە:
مێروولە

ئەگەر تەرمی گەڵاکانی پایز
بۆ گەن بکەن
دەبێ هەمووماں ببین بە:
گۆڕهەڵکەن

چی دەکەی گەر شەوێك لەخەو  هەڵسایتو
ببوویت بە:
دووپشکێك

وەکو باڵندە دەفڕێ
بەڵام لەئاسمانەکانی ناو ئاودا،
ماسی

کە زرمەی پێی رەشەبا دێ
گوێ رادێرن... بەدڵ
شیوەن دەکەن...
هەزاران،
گوڵ

دەنگی زەنگۆڵەی گوڵ دێ
بەرەوئێرە هەنگاو دەنێ
بەهار

جێی هەزاران چۆلەکە دەکاتەوە
درەختێك
هەزاران چۆلەکە پەڕاگەندە دەکات:
فیشەکێك

هەمووومان بووبین بەرۆبۆت
فێرمان بکە کام مەشق
دەمانکاتەوە بەمرۆڤ
تۆ ئەی:
عەشق

کەدەنووسم تۆم خۆشدەوێ
هەزاران گوڵ
لەژێر خامەکەمدا دەڕوێ...

لەدوای ئەنفال
کەس لە گوندەکاندا
نەمایەوە
جگە لە: خەم و

تەنیایی
لەدوای کیمیا بارانەکە
زامی شەهیدەکان
لەهەڵەبجەدا بوون:
بەگوڵستان...

ئەرێ
رەشەبا بەپێ دزکێ
ئەم هەموو لیرانەی پایز
بۆ گەردنی چ نازدارێك
دەدزێ...

دوو دڵۆپە شەونم لەچاوی ئاسمان
هاتنەخوارو کەوتنە سەر خونچەیەك
شەونم نەبوون دوو دڵداربوون
دەمیان نایە ناو دەمی یەك

دوای هەموو شەوێك... لەکون.... دەردەچن
بەهەر چوار لادا پەخش دەبن....
وەکو رەشمار
شەقامەکانی شار...

# مشتومڕی
# گورگو راوچی

پیره گورگێکی برسی

کەوته ناو تەڵەی راوچی

که راوچی هات

بەر تێلاو کوتەکی بدات

گورگ لەترسا هاته زمان

- بۆ لێمدەدەی... بۆچی دەمکوژی راوچی

من زیانی چیم بۆت بووه... دەبڵێ چی

+ چونکەگورگی

مێژووت هەمووی

دڕندەییەو تاوان...

- ڕاست دەفەرمووی

بەڵام قوربان

خۆ هەن لەمن

زۆر گورگترن

لەکوردستان

کردوویانن بەوەزیرو بە ئەندامی پەرلەمان...

# دیرۆکی داربەڕوویەکی دێرین

دار بەڕوویەکیان دەبڕییەوە
هۆن هۆن دەگریا
ناڵێنو فرمێسک دەباری بەسەر
گۆناو بەرۆکیا

- تۆ کەی گریاوی پیرەدار بەڕوو...
لەچی دەترسی
+ لەوە دەترسم بۆ دیکتاتۆرێك بمکەن بەکورسی
* * * * * * * * *

# لەبیرچوونەوە

زۆر سەیرە... و ئەمەیە کێشەوگێرە

لەبیرم نیە... نی....

بۆچی هاتووم... بۆچی...

بۆ ئێرە

* * *

# سێ نهێنی ونبوو

یەکەم جار
بۆ هەڵواسینی شەبقەکەی
شارلی شاپلن دروستکرا
نەك بۆ هەڵواسینی ئەویندار
بزمار
* * *

ناوێرن ئاشکرای بکەن بۆمان
پڕە لەخەونی مینرێژکراو
ژێر سەرینی:
منداڵەکان...

بۆ رامالینی تاریکیو
سەرماو بەفر
دۆزرایەوەو کەوتە سەماو شنە شن
نەك بۆ سووتاندنی دێکەی من
ئاگر

# عەشقنامەی
# عاشقە نەناسراوەکان

بەسەر ئەو دارستانەدا دەگری
ئاخۆ عاشقی چ درەختێك بووە
هەور

هەر سەرنجی زدوی دەدات
ئاخۆ چ خۆشەویستێکی کەوتۆتە خوارەوە
مانگ

قەڵەملێوێکی تۆخ تۆخ تۆخ
بەکاربێنە
باکەس بەلێوتەوە نەیبینێ
ماچەکانم

دەترسم رۆژێ تۆم لەگیرفانەکەی سەر دڵمدا
لەبیر بچێ
لەگەڵ کراسەکەمدا بتخاتە جلشۆرەکەوە
هاوسەرەکەم

تەماشام کە رووتم وەکو رووبار
پرچەکەی تۆم
لەبەر کردووە یار

واهەستدەکەم رووتی وەکو هەتاو
شیعرێکی من
لەبەر بکە...

گەر بزانم بەو دەستو پەنجانەت
پاکم دەکەیتو دەمخۆی...
بەو لێوانەت
دەبم بە:
پرتەقاڵێك

کەخەندەیەکی تۆم
بەلێوم دزی... لەناکاو
بووم بە:
هەتاو

بۆ هەر کوێ دەڕۆم
تۆ لەوێی یار
تۆ یەکێکی ... یا
هەزار...

بەهەر دە پەنجەکەم گشت رۆژێ
هەزاران جار
ناوە  جوانەکانی تۆ دەژمێرم
بۆیە زەوی پڕاوپڕ بووە لەرووبار

پەنجەکانم چەند کەمن
ناوە جوانەکانی تۆ
چەند
زۆر...

زۆر بیرم کردەوە
لەکۆتاییدا زانیم
لەزەردەخەنەی تۆ دەچێ
مانگ

زۆر لێ ی ورد بوومەوە
لەدواییدا بۆم دەرکەوت
لەپرچی تۆ دەچێ
پەلکە زێڕینە

زۆر لێکم دایەوە
دوایی زانیم
وەکو دەستی تۆ سەرنجڕاکێشە
کاغەزی سپی

دەمو لێوم رازاندۆتەوە
بەماچی
تۆ
پەنجەکانم گرتووە لەخەنە
بەخەندەکانت
جەژنە

ئەوە بەفرە دەباری
یاتۆی جلەکانی بەرت لەو لووتکەیەدا
بە شالقی باکاندا
هەڵدەواسی....

خەوم دێ
دام پۆشە بە گەڵاو گوڵی
خەندەکانت

بەر لەوەی تۆ پێبکەنی
تاریك... تاریك بوو
شاری دڵم
با هەندێ مرواری
کۆبکەمەوە
پێبکەنە

**کەدیار نامێنیٚ**
**لەگوێی تۆدا دەبیٚ**
**بەجووتیٚ گوارە**
**مانگ**

**چەتر بەزستان**
**خۆشی لیٚ دەچۆڕیٚ...**
**کەتۆ دەبینیٚ؛**
**دڵم**

**بۆ خۆمە ونبۆکەم دەگڕام**
**تۆم**
**دۆزییەوە... حەپەسام**

**شەوبوو ماچمان کرد**
**بەسەدان چرا و مۆم**
**گەورەترین کتێبی عەشقمان نووسی**
**خۆتو خۆم...**

**خۆت کاندیدکە**
**بۆ شاجوانی... سەدەی بیستو یەك و دووەم**
**تەنهاو تەنها**
**من دەنگ بۆ جوانی تۆ دەدەم...**

لەوەتی تۆم خۆشدەوێ
بڕۆم بۆ کوێ
هەزاران گوڵ
دوام دەگەوێ...

لەو ساوە تۆ خۆشتویستووم
گوڵ لەهەموو دەفتەرەکانمدا دەڕوێ
لەوساوە تۆ ماچت کردووم
خۆر لەسەر لێوم دەنوێ

بۆنی دەستی تۆیان لێ دێ
بۆیە بەچڵکنی
لەبەریان دەکەمەوە

جلەکانی دوێنێ و پێرێ
نەئەستێرەیەکیان
تیادا دەدرەوشێتەوە
نەچرایەك
هەر شەپۆلی تاریکایین
چاوەکانت...

وا راهاتووم چیبکەم
ناوە جوانەکانی تۆو
ماچەکانمانو
ژمارەی ڤایبەرەکەت دەژمێرم
بەدەنکەکانی
تەزبیحەکەم

ئەوەندە دڵم پێیان خۆشە
دەمەوێ
بەتەنافێکدا هەڵیانواسم
هەموو کەسێ بیبیانبینێ
ماچەکانمان

هەموو جەستەم تاریکە
دڵم نەبێ
تۆی تیای
دڵم

لێم ببوورە... هەر شەوێ
بێتە بەر پەنجەرەکەم
ئەو شیعرانەی بۆ دەخوێنمەوە
کەبۆ تۆم نووسیون
چونکە نەختێ
لەتۆ دەچێ
مانگ

هەموو شەوێ چاوەڕوانی تۆ دەکەم
دوای چاوەڕوانی یەکی زۆر
لەدەرگاکەم دەدات
خۆر

لەوساوە کەخەندەیەکتم نۆشیوە
مەستی بەرم نادات
نەقیبلەم پێ دەدۆزرێتەوە
نەرێگای مزگەوت

کەسەرنجی تۆ دەدەم
خۆم دەبینم
من بۆ
بووم بە:
تۆ
کە سەرنجی خۆم دەدەم
تۆ دەبینم
تۆ
بۆ بوویی بە
من

شنەبامان بۆ دڵمان کرد
بەجۆلانێ
جوانیمان کرد بەبەر
گوناحدا
گوناحی راکردن
لەپیرێتی
گوناحی گەڕانەوە
بۆ منداڵێتی
بەلادانی
- حەزەوانی-

کەهاتم بۆ لات
یەك پیاڵە چاتێکە
من لەفنجانی دەمتدا
چا دەخۆمەوە...

هیچ ڕێگایەك ناڕوات بۆ ڕۆما
هەموو ڕێگا ڕۆمانسییەکانو
هەموو جادە سوریالیزمییەکانو
هەموو کۆڵانە کلاسیکیەکانو
هەموو شەقامە داداییزمییەکان
دێن بۆ لای
تۆ

لای کەس ناوم نەدرکاندویی
من
بۆنی جوانیت لەبێدەنگیمدا دەکەن
ئەوان...
تەنانەت کتێبەکانمو
چۆلەکەکانی ئاسمانو
زەرنەقووتەی ناو هێلکەی
ژێر باڵندەکان
تۆ دەبینن
لەدڵما

حەز دەکەم شیعرێکم
لەسەر لێوت بنووسم بە:
زمانم؛

دڵم ناوێرێ
لەنێوانیاندا بنوێ
دەترسێ
دوو نارنجۆك بن
مەمکەکانت

دەستەکانت
دوو کڵێسان
پەنجەکانت
دە مۆم

بەر لەوەی تۆ پێبکەنی
لە زەویدا نەڕوا بوو
گوڵ

تا تۆم نەبینیبوو نەمدەزانی
گورزەیەك لە پرچی تۆی دزیوە
هەتاو

تا تۆم نەناسیبوو نەمدەزانی
نەختێك لە سوورایی لێوی تۆی قەرزکردووە
زەردەپەڕ

فەرهەنگێکی بێ کۆتاییە
هەزاران هەزار وشەی نوێی
تیا دەدۆزمەوە
عەشقت

کەلە دایکی توورە بوو
لەلووتکەیەکەوە خۆی
هەڵدایە
خوا
رە
وە
تافگەیەك...

تۆزقاڵێ گڵ بووم
خوا فووی بەگەروومدا کرد
بووم بەشاعیر

منیش فووم بەگەرووی
فەرهەنگێکدا کرد
وشەکانی بوون بە
باخچە

باخچەکە بانگی چۆلەکەی کرد
چۆلەکە بانگی هەتاوی کرد
هەتاو بانگی بای کرد
با بانگی سەربەستی کرد
سەربەستی بانگی
ئاسوودەیی کرد
لەپڕ
هەر لەپڕ
منو
باخچەکەو
چۆلەکەو
هەتا و و
با و
سەربەستیو
ئاسوودەیی
داگیرکرد بۆ خۆی
کچێک...

من نازانم خۆشەویستی لەکوێوە دێ
چۆن گوڵەکانی دەپشکوێ
هەر ئەوەندە دەزانم
کەکچێکم خۆشبوێ
ئەڵێی لاوەکەی جارانم
مووی رەش... رەش... رەش
سەر لەنوێ
لەسمێڵو لەریشو لەسەرم دەڕوێ

من نازانم خۆشەویستی
چۆن چۆنی دێ... هێدی هێدی
دەتەنێ دەورو بەرم
هەر ئەوەندە دەزانم
کاتێ کچێ خۆشمی دەوێ
هێندە نمەباران دەگرم
بەهەر شوێنێکدا تێپەڕم
هەر وا دەزانن هەورم

من نازانم خۆشەویستی
لەکوێوە دێ
هەر ئەوەندە دەزانم
کەکچێ خۆشمی دەوێ
لەتوێی سنگمدا دەڕوێ
دڵێکی نوێ

بەگوڵێك... نا
بەماچێکی تۆ... زۆرجار
لەدایك دەبێ
بەهار

من عاشقی کاغەزی سپیم
جوانترین کاغەزی سپی یە
جەستەت

من شەیدای پشکۆم
گەشترین پشکۆیە
دەمت

خۆم خانەنشینم
پاسەوانی دارستانی پرچی کچێکە
دڵم

من سەوداسەری شەوم
شەوترین شەوە
پرچت

خەمی بوونو نەبوونی کارەبام نیە
لەژوورەکەمدا
بوون بەهەزاران هەزار
چلچرا
خەندەکانت
* * *

نەتامەزرۆی بەهەشتە
نەلەدۆزەخ دەترسێ
سۆفی
عەشقت

دڵم چۆڵ کردووە بۆتۆ
ئەگەر هەستت بەتەنیایی کرد
بانگم بکە...

لەوەتی ئاونگی دەمت
بەسەر لێومدا باریوە
دڵم تۆراوە لە:
ئاو

لەسەر هەر تاشەبەردێکدا
هەڵکۆڵم وێنەکەت
پێدەکەنێ
کانی یەك
لەناو لمی هەر بیابانێك
بچێنرێ ناوت
هەناسە دەدات
گوڵستانێك...

کەدەنووسم تۆم خۆشدەوێ
هەزاران خۆر لەئاسمانی ژوورەکەمدا دەردەکەوێ

دەتوانین جوانترین باخچە
لەژوورەکەماندا دروستبکەین
بەگوڵی رەنگاو رەنگی
ماچ

زۆر بۆی گەڕام بەئاشکراوبەپەنهانی
لەتاریکایی چاوی تۆدا
خۆی ونکردبوو
جوانی

بەر لەوەی خوا
چاوەکانی تۆ درووستکا
سپی... سپی بوو
شەو

* * *

چرایەك هەڵکە
لەتاریکایی چاوتدا ون بووە
دڵم

خوای مەزن هەموو ناوە خۆشەکانی فێرکردم
خۆشترین ناوبوو ناوی
تۆ

بووە بەشووشە گوڵاو
ماچەکانتی لێ دەچۆڕێ
دەمم

بوون بەدوو ئەستێرە
بەبنمیچی ژوورەکەمەوە
چاوەکانت

بوون بەنەخشی سەر
خەتوخاڵی رایەخی ناوژوورەکەم
شوێن پێکانت

بووە بەپەیکەری جوانی
لەسەر کورسی ناو ژوورەکەم
سێبەرەکەت

هەموو زمانە دێرینەکان ناتەواون
دەمەوێ لەپیتە بێ کۆتاییەکانی بێدەنگی
بۆ پەیڤین لەگەڵ تۆدا
دروستبکەم زمانێکی
نوێ

بۆ لە ئامێزگرتنت
هەزار دەست
کەمن
هەزار پێ بەشی ئەوە ناکەن
چرکەیەك راکەم
بەدواتدا
یەك ملیار دەمیش ناتوانن
هەموو ناوە نهێنییەکانی تۆ
بژمێرن

لەسەر هەر درەختێکدا
دوو چۆلەکە
شیلەی دەمی یەکدی بخۆن
دڵی منو
دڵی
تۆن

هەور هاتو
ئاسمانی شەوی دزی
ئێمە
ئاسمانمان پڕاو پڕ کرد
لەمانگو
ئەستێرەی
ماچ...

لەدەرگای دڵم مەدە
کەس دەرگات لێ ناکاتەوە
کەس
کەس
جگە لە:
خەم...

* * *

بەسەر پرچەکەتەوە
چەند جوانن
پەنجە مەرەکە باوی یەکانم...

# پۆلێك شیعری
# مینیجۆب‌و میکرۆجۆب

کەسەرنجی مانگم دەدا
خودام تیادا دەبینی بە:
منداڵی

کەتەماشای دەکەم
زۆرجار وێنەی تۆ دەکێشیٚ:
هەور

لەوەتی تۆم خۆشویستووە
زووتر لەدایك دەبیٚ:
بەهار

بووکەشووشەیان ناوێ
خۆیان بوونەتە بووکەشووشەی دەستی جەنگ
منالّەکان

پارچەپەڕۆیەك نیە
دەرپێی نیشتمانە:
ئالاّ

دەمێکە تیرۆر کراوە
ئەوە بۆچی هونەرمەندێك
لەبەر دەرگی سەرادا
یالە داوێنی قەلاّدا
ناتاشێ پەیکەری تەرمەکەی:
ئازادی

بووەتە وەرزی هەمیشەیی
نیشتمانە داگیرکراوەکەمان:
جەنگ

چەکی دیکەیان نیە
هەر بەنارنجۆکی مەمك
شەڕ دەکەن:
کچان

جاران تەنها کڕنووشی بۆ
خودا دەبرد
ئێستا بۆ:
تەختی وەزیریو
ئەستێرەکانی وەرزشو
نەوتو کورسی پەرلەمان
کورنووش دەبات:
موسڵمان

تەنها لە سروودی قوتابخانەکاندا
ماوەتەوە
جوانی:
نیشتمان

جوانترە لەمانگ لەتوێی لێوی کچێکدا:
بێدەنگی

زۆرجار لەسەر لەبەرنەکردنی
وانەکانم
سزای دەدام مامۆستا
نەیدەزانی لەبری وانەکانم من
سەرقاڵی ئەزبەرکردنی
ناوە جوانەکانی:
تۆم

ناوی هەموو یاریچییەکانی جیهان
دەزانن
ناوی یەك شەهیدیان لەبەر نیە:
منالەکانمان

جاران دەیان خۆپێشاندانمان دەکرد
ئەم وڵاتە گڵاو نەکەن داگیرکەران
ئێستا پێڵاویان ماچ دەکەین
جێمان نەهێڵن بەتەنیا
دەبێ شەهیدانی ئازادی
چەند تفمان لێ بکەن
لەو دونیا...

جاران زەوی نیشتمانمان بوو سەراپا
ئێستا تەنها هەر... یەك:
جانتا

لەسەهۆڵبەنداندا هەڵکۆڵرابوو
کەهەتاو پێکەنی
توایەوە دروشمی:
کوردستان یا نەمان

بەبێ بایەخی سەرنج مەدەن لەهیچ
سەرەنوێلکێك
دەشێ لەژێری دا پێبکەنێ:
چاڵەنەوتێك

گوێبگرە... گوێبگرە
لەوانەیە لەدیواری ژوورەکەتدا
سیخورێك بێ:
پەنجەرە

خودا درەختەکانی کرد بەجۆلانێ
بۆ ئەو گشت پەپوولەو باڵدارە
زۆردارەکان هاتن کردیان
بەسێپای پەتی:
قەنارە

لەهەر کوێ هەن
پەیکەری گشت دکتاتۆر...و
قەڕاڵەکان
سبەی وەکو بووکە شووشە
گەمەو یارییان پێدەکەن:
منداڵەکان

چەکی قەدەغە کردووە ئاسایشی کوردستان
کەچی جووتێ نارنجۆکیان
بەئاشکرا بەسنگیانەوە بەستووە
کچان

چەند دڵڕەقن
هەر نارنجۆکی مەمك
دەخەنە ناو دەمی عاشقەکانیانەوە
کچان

دەمەوێ خۆم بکوژم
وەرە بالە دەممدا بتەقێنمەوە:
نارنجۆکی مەمکت

ترس لەدڵیدا نەڕواوە
کاتو ناکاو
دەچێتەناو
گەرووی شێرو ئەژدیهاوە:
ئاو

گوڵو دڕك
دەکات بەدراوسێی یەکدی:
باران

هەر بیر لە دۆزینەوەی
زەلکاوێکی دی دەکاتەوە:
بۆق

هەر بیر لە پشکووتنی
شەڕێکی دی دەکاتەوە:
شرەخۆر

بۆ بەچکە کوژراوەکانی
ڕەشی پۆشیوە:
قەلەڕەش

هاتوچۆی
مزگەوتو
کڵێساو
بتخانەش
دەکات
دەمارگیری ئاینی تیادا نیە:
ڕەشەبا

کێ دەڵێ ئەم وڵاتە شەمەندەفەری تیانیە
ئەی ئەوە نیە ڕۆژی مووچە وەرگرتن
درێژترین شەمەندەفەر درووستدەکەن:
خانەنشینان

سەرم هەوری تیانەبێ
لەکوێوە دێ:
فرمێسک

چەند کینە لەدڵە
هەموو دەمێك ئامادەی
سەر پەڕاندنە:
شمشێر

خۆی دا بەزەنگی کڵێسایەکدا
باڵندەیەك
بوو بەژیر... سەهۆڵبەندانی پرسیارەوە:
گوندێك..

دەنگی زەنگۆڵەی گوڵ دێ
بەرەو ئێرە
هەنگاو
دەنێ:
بەهار

چەند بەخشندەیە
هەرچی پارەی هەیە
بەسەر ئەمو ئەودا دابەشی دەکات:
ژمێریاری بانق

بەفێڵێك هەندێ
سەرماو بەفرو زریان
هەندێ
هەوری چاو پڕ گرین
دەدەمزم لە زستان
پاشەکەوتی دەکەم بۆ:
هاوین

رقوخۆشەویستی
لەخۆت داماڵە
دەبی بە:
رووبار

بەهاران دەیەوێ بڵێ
منیش وەکو
پ
ر
چ
ی
ك
چ
ا
ن
جوانم:
پەلکەزێڕینە

نەپەلکەزێڕینەیە
نەگورزەی هەتاو
نەسەوزە گیایە...
نە ئاگر... نەباران
هەر پرچی کچانەو لەهیچی دیکە ناچێ:
پرچی کچان

خوا ئۆقیانووسی لەناو درووستکردووە
لەخوێنی ستەمدیدەکانی
درووستدەکات:
زۆردار

هەموو کەسێ
سەری بۆ دادەنەوێنێو
بۆ کەس سەری نەوی ناکات... نا:
چیا

گوێ رادێرن
لەژێر خۆڵەمێشی سەهۆڵبەنداندا
تریقو هوڕ پێدەکەنن چڵ چڵ
هەزاران هەزار:
گوڵ

تەنها یەك جۆرە چەك
سەرنجم رادەکێشێ
نارنجۆکی:
مەمکی کچان...

# لەدەرەوەی ناونیشان

نیشتمانی لەبیر بردووینەتەوە
نەوت
کردووینی بەدوژمنی نەتەوە
نەوت
دەوەرەوە
دەوەرەوە
فێری عەشقی نیشتمانمان بکەرەوە
پڕمانکەرەوە لەخولیای سەربەخۆیی،
حاجی قادری کۆیی

دوو شت زۆر لێکدی دەچن
دوو شت... زۆر زۆر
قەدعەی ژێر منداڵی کۆرپەو
تاجی سەر سەری دیکتاتۆر...

شیعری دڵداریو نوکتەیان
لێمان حەرامکردووە
لەبێ عەشقیو
بێ خەندەیی
تێکرای دڵەکان مردووە
دەوەرەوە
دیسان بنووسەرەوە
بەرگێکی دی
(رشتەی مرواری)و
(مێژووی ئەدەبی کوردی)

بدوێ
بەوردی
دەربارەی شیعری دڵداری
شیعری تاهیر بەگو ناری
شیعری خانای قوبادی
مەلا عەلادین سەجادی

شەقامەکانیان کردووە
بەکێلگەی نارنجۆکو مین
نەعەشق ماوە نە پێکەنین
دڵداری لەم شارەدا لەبارچووە

**هەزاران عاشقی مردوو**
**هەزاران عاشقی زیندوو**
**چاوەڕوانن بەشیعر و داستانی ئەوین**
**شەقامەکان پڕکەیتەوە**
**لەرازو نازی**
**مەم و زین**
**لەبریسکەو لیسکی جوانی:**
**مامۆستا ئەحمەدی خانی**

**کەدووکەڵ لەم دەوروبەرە**
**بەرز نابێتەوە... بۆ ئاسمانێك**
**دیارە نەگوندێك لێرەدا هەیە**
**نەشوانێك...**

**سروشتیان نابووت کردووە**
**درەخت بەزیندوێتی مردووە**
**نەگوڵ جوانی**
**لێ دەبارێ**
**نەدارستان**
**چاوەڕێتن عاشقانی**
**(سەر شەقام)و**
**(سەهۆڵەکە)و**
**(کانێسکان)**
**شەیدایانی (مەڵکەندی)و**
**(سابوونکەران)**

تۆ بێیتەوە
جوانیو ئەفسوون بدەیتەوە
بەوەرزەکان
مامۆستا
عەبدوڵڵا گۆران

هێندە پرچو خەندەی دەمو
درەختو گوڵی سووتاوە
هێندە هۆنراوەو رۆمانی
بێ رەنگو بۆی بۆ نووسراوە
هێندە بەدوو گەڵو درۆ سواغدراوە
هێندە وەکو دیلو کۆیلە
بەم دراوسێو بەو هاوماڵە فرۆشراوە
رۆژێ توورە دەبێتو
نەفرەت دەکات لەهەمووەمان
گڵەزەردەو
هەیبەت سوڵتان
قەڵای کەرکووکو زێی سیروان
دەخاتە ناو جانتایەکی گەورەوەو
لەگەڵ هەندێ قاچاخچیدا
دەڕوا بەرەو هەندەران:
نیشتمان

# یازدە شیعری میکرۆجۆب

گورزەیەك لە پرچەكەتم بدەرێ

با لە ژوورەكەمدا بیكەم

بە:

هەتاوێك

خەندەیەكتم پێ ببەخشە

با ئەمشەو

لە ئاسمانی حەوشەكەماندا

بیكەم بەمانگ

هیچ شتێك بوونی نیە
بەبێ:
من

کەدەسورێتەوە مەستی نایەکەی
مەولانای رۆمی یە:
دەستار

فرمێسکی خودایە
شەوان بەسەر
گوڵو درەختدا دەباری:
ناونگ

دارستانەکان قژی خۆیان دەڕنن
لەگیانەڵادایە:
بەهار

کە دەتوێتەوە زمانی ئەوەندەی
سەد شەمەندەفەر
درێژ دەکات:
بەفر

چەند بەختەوەرە
هەمیشە گورزەی پرچت
ماچ دەکات:
شانە

کێ دەڵێ
زامو برینی عاشقەکان نین:
گوڵ

شانازی پێوە ناکرێ
مەترسی یە
مەترسی
بووە بەسومبلی دزی:
کورسی

زولێخای پیرو کوێر کرد
یوسف نا
عەشق

هەرچەند دەکات
سێبەرەکەی خۆی
پێ راو ناکرێ:
من

# هەشت شیعری مینیجۆب

ئەوان سەد جار سومبولی ستەمدیدەیین
دەجار لەبەر ئەوەی کوردن
نەوەد جاریش لەبەر ئەوەی:
کاکەیین

هەردوکمان عاشقین هاوڕێ
جیاوازی منو تۆ ئەوەیە
تۆ عاشقی:
کورسیت
من عاشقی:
لەیلا

کێ دەڵێ نادوێ
دەشێ کەحەپە حەپ دەکات
بڵێ بابڕوخێ دیکتاتۆرەکان:
سەگ

بەچاوی دڵ سەرنجی شوێنەکان بدەی
لەمزگەوتو
کلێساو
بتخانەو
مەیخانەدا
دەگەیتە بەردەرگای ماڵی:
خودا

دوێنێ بەیانی
شەوانی خۆشی
لادێی هێنامەوە یاد
لە سووچی مەزادتخانەیەکدا:
فانۆزێك

ئەم چێشتەنگاوە
لەهۆڵی مۆزەخانەیەکدا
تامی نانەگەنمە خۆشەکانی
دەستی دایکمی بیر خستمەوە:
تەنوورێك

بەمندالی دەمان خستە
ناو ئاگری مەقەڵی و.... کوانوو
چەند خۆش بوو کەدەتەقییەوە
دەنکەبەڕوو

بەمندالی کەتاکە سۆڵو
بەردمان
تێدەگرت... چەند خۆشبوو
وەك باران
دادەباری یە سەرسەرمان؛
دەنکەتوو

من تەنیا یەك شتم دەوێ
وەکو جاران
خۆشمت بوێ...

# دە شیعری مینیجۆب

ئەگەر شەش حەوت کوڕی
لەشەڕی برا کوژی دا
جوانەمەرگ نەبوبێت
چۆن ئەو هەموو فرمێسکە
دەڕژێنێ:
هەور

ئەگەر بەچاوی دڵ سەرنجی بدەی دەیان دڵدارو دڵخوازی
تیادا دەدۆزیتەوە:
ئاوێنە

زۆر ترسنۆکەو لەشەو دەترسێ
هەر تاریکایی دەرکەوێ بەپڕتاو
دەڕواتەوە بۆماڵی خۆیان:
هەتاو

دوێنێ بەم خاكو بوومەدا
تێپەڕی
سەدان زارۆڵەی بێ باوكو
سەدان ژنی بێ هاوسەری
لەو ماڵەدا بەجێهێشت:
شەڕ

ئێمە گوێمان لێی نیە
دەچەنانەی دەنگی بوومەلەرزەو گەردەلوولە
دەنگی شەقەی شاباڵی؛
پەپوولە

دەڵێی جیاوازی چینایەتیو نەتەوایەتی
دەكات
بەسەر هەندێ شوێندا پێدەكەنێو
بەسەر هەندێ شوێندا
باز دەدات:
باران

ئەگەر خەون ببینێ
لەخەوی دا مرۆڤێك راو دەكات
لەتوێی گەڵای درەختدا
وشكی دەكاتەوە:
پەپوولە

چەند میهرەبانە
ئەو هەمووو ئاوازە خۆشەی
بۆ ئێمە لەگەرووی دا شاردۆتەوە:
قامیش

کەس نازانێ بەدوای چیدا
سەرگەردانو وێڵە
وا هەر رادەکاتو چرکەیەك پشوو نادات:
رووبار

مشتومڕی ناوێ قەفەزی شێریش
هەر قەفەزە
بەلام پیێ دەڵێن:
قەفەزی شێر

# رستەیەك
# شیعری میكرۆجۆب

بەبینینی كۆلارەی دەستی منداڵێك
گەڕامەوە بۆ ماڵی:
منداڵیتیم

لەدێر زەمانەوە
هاوڕێن
چۆلەكەو
گوڵەگەنم

لەدێر زەمانەوە
ناحەزن
جووتیارو چۆلەکە

لەپشت هەموو
پەنجەرەیەکی داخراودا
نوستووە؛
بایەك

دوو عاشقی بێ شەرمن
هەمیشە بەبەرچاومانەوە
جووت دەبن؛
دەرزیو
دەزوو

ناویان
لەلووتکەی هەموو چیاکانی جیهان
نەمرترە: شەهیدان

ناویان
لەگشت هەتاوەکانی ئاسمان
گەشترە؛
عاشقان

لەترسی کێ وەك مەلی کڕ
خۆی لەناو بەرددا شاردۆتەوە
ئاگر

# ئایەتی چاوەڕوانی

لە ژێر دەوارێك

چرایەك کات لەدوای کات

چاوەڕوانە

بەردە نەستێیەك هەڵیکات

* * *

لەشارێك

گۆڕەپانێك سات لەدوای سات

چاوەڕوانە  یاریچییەك

تۆپێکی پێی بۆ ببات

* * *

دوور لەچاوی ئاخوندەیەك...

هەمیشە ماكسی یەك

چاوەڕوانە

بەژنێكی رووت رووت بگات

لەگوندێك

* * *

شەو و رۆژ قفڵێك

چاوەڕوانی

كلیلێكە بەناو هەناوی دا بڕوات

لەدوندێك

* * *

نیشتمانێك

چاوەڕوانە گڕی فڕۆكەیەك بیخوات ... شەوێ

لێرەو لەوێ

* * *

لەوێ... من هەردەم

چاوەڕوانی خۆم دەكەم...

# بارانی گوڵو پەپوولە وێڵەکان

خەون بەوەوە دەبینم
کەسبەینیێ سێدارەکان
هەمووی بکەم بەجۆلانێ بۆ
پەپوولەو پاساری و شەونم

هەر خەیاڵی ئەوە دەکەم
سبەی لەسەر ئاگری
قۆناخە تفەنگەکانتان
چایەکی خەست لێ بنێم بۆ کۆڵبەرەکان

هەر سێو دووی ئەوە دەکەم من
ئاسنی مووشەکەکانتان
بکەم بەداسو گاسن
بۆ  جووتیاری گوندەکەمان

هەر وام لەو کەینو بەینەدا
کۆتی پێی ئازادیخوازان... بکەم
بەسکەی شەمەندەفەرێك بەڕێیخەم
لەنێوانی سلێمانیو سنەدا

دەمێکە ئەڵوەدای ئەوەم
گشت کۆشكو تەلارەکانتان
بکەم بەمۆزەخانەی... پەیکەری
شەهیدەکان...

هەر بیر لەوە دەکەمەوە
تەختو عەرشی پاشاو دکتاتۆرەکان
بشکێنمو بیکەم بەبێشکەو ڕەوڕەوە
بۆ منالّی هەژارەکان

چەند دڵخۆش بم وا هەست دەکەم
ئەشکێك بەگۆشەی چاومدا دێتە خوارێ
ڕەنگە بۆ ئەو منالّە بێ... کات لەدوای کات
بەهەر چوار لادا دەنوارێ
چاوەڕوانی گەڕانەوەی باوکە کۆڵبەرەکەی دەکات...

چەندێ ئاسوودەبم هەر هەست
بە قورسایی خەمێك دەكەم لەناو دڵمدا
تاریكو خەستو پڕ لەژان
ڕەنگە بۆ ئەو منداڵە بێ... كەدایكی
لێ دزی
بوومەلەرزەكەی كرماشان...

چەندێ
چەندێ
چەندێ
چەندێ... چەندێ... چەندێ... نائومێدبم
چاوەڕوانی ئەوە دەكەم دڵم پڕكا
لەبریسكەی روونی ئومێد... نووری خودا...

# ئەو شیعرانەی
# کە ناخرێنە قەفەزەوە

هەرچەند چاوت بەنیگایەك
لەگەڵ دڵمدا دەدوێ
خۆرێکی دی
لەسەر لووتکەکان دەڕوێ

بەتەقەیەك هەڵدەگیرسێ
ئاگری شەڕ
بەخەندەیەك
بڵێسەی عەشق

منو ڕێگاکان هەر دەڕۆینو هەر دەڕۆین ...بەبێ وەستان
من دەچم بۆ لای تۆ
بۆ لای کێ دەچن،
ڕێگاکان

کەدەدوێ... گوڵەگەنم
دەبارێ
بۆیە گەمارۆت دەدەن،
چۆلەکەو هەموو باڵدارێ...

دوو بەرد لێك بدرێن
گڕ هەڵدەقوڵێ
لێك بدەن دوو دەم
جیهان گڕ دەگرێ

گڕ هەڵدەقوڵێ
دوو بەرد لێك بدرێن
جیهان گڕ دەگرێ
لێك بدرێن
دوو دەم

رۆژی ژێر چەترەکەی تۆم
دێنێتەوە یاد
هەموو،
بارانێك

کە با هەڵدەکات
تۆی
تۆ... بۆ لای من،
دەڕۆی

ئەگەر عاشق نیە
ئەم هەموو گوڵە بۆ کێ دێنێ:
بەهار

من بەفر نیمەو
دڵۆپ
دڵۆپ
د
ە
ت
و
ێ
م

ه

و

ه

کەتۆ:

پێدەکەنی

رۆمای سووتان نەیرۆن

تۆ:

دڵم

مۆسکۆی داگیرکرد ناپلیۆن

تۆ:

رۆحم

لەشەڕی دووەمدا

تێکشکا

ئەڵەمانیا

لەشەڕی عەشقی تۆدا:

من

خەندەیەکتم بەجەژنانە  بدەرێ لەناکاو
با لە شەوی شارە بچکۆلەکەمدا
بیکەم بە:
هەتاو

چۆڵی ناکەم
هەریەك وڵاتم هەیە
یەك وڵات
دڵی:
تۆ

بۆ لەو بەرزاییەوە
خۆی
دەهاوێتە
خوارێ:
لەداخی کێ
خۆی:
دەکوژێ
تافگە

کێ پێی گوت... کێ...
تۆی خۆشبوێ:
دڵم
ئەگەر عاشق نیە
بۆچی ناوهەناوی پڕە لەئاگر:
بەرد

سەدان هەزار جار
ژمارەی شەهیدەکانمان
زۆرترە لەگوڵی بەهار

رەنگە دەریاچەی دووکان
وشك بکاو ببێ بە زەلکاوێ لێخن
سەرم هەرگیز خاڵی نابێ لەعەشقی: خوداو
ژن

# چەند شیعرێکی
# راکردوو لەیاسای شیعر

لەهەموو جێگاکاندا
تامەزرۆی دۆزینەوەی:
ناجێگایەکم

لەهەموو کاتەکاندا
سەودا سەری لەدایکبوونی
ناکاتێکم
لەهەموو شارەکاندا

بەتەمای بینینی:
ناشارێکم
لەهەموو - تۆ- کاندا
چاوەڕوانی دیداری:
ناتۆیەکم

لەهەموو منەکاندا:
چاو بگێڕە بۆ:
نامنێك

لقی داری بیرەوەریم راوەشێنم
هەموو گەردوونی بەرین
پڕ پڕ دەبێ: لە
برین

فێری ئەوەی کردم تەنیا
رەنگی رەشم
لەلاجوان بێ:
چاوت

ئەم هەموو گوڵە چۆن
لەمنداڵدانی خۆی دا گۆش دەکات
بەهار

هەمیشە بەپەڕوتووکی باڵندەکان
فارغۆنەکانی خۆی
دەڕازێنێتەوە شەمەندەفەری:
ڕەشەبا

هەر چوار وەرزەکە بووە
بەکاسکێتی سەری شارە بچکۆلەکەم:
شەو

هەزار ساڵە بۆی دەگەڕێمو نایدۆمەوە
تومەز تۆبۆ خۆتت کردووە بەپرچ:
هەتاو

لەشەڕدا هیچ شتێکیان لەیاد نامێنێ
جەنگاوەرەکان جگە لە:
ژن

لەشەڕدا نەبیر لەتێکشکان دەکاتەوە
نەسەرکەوتن
تەنها گەڕانەوەی جگەرگۆشەکانی لەبیرە:
دایک

جەژنی گۆڕهەڵکەنو
کفن فرۆشە:
جەنگ

لەگۆڕەپانی شەڕی براکوژی دا
نەفرەت لەهەموو جەنگاوەرەکان دەکات:
نیشتمان

لەنێوانی هەمووحزبێکو حزبێکدا
دوو سێ حزبی دی هەیە
لەنێوانی شاعیرێك و شاعیرێکی تردا
سەد شاعیری برسی هەیە
لەنێوانی بانگخوازێکو بانگخوازێکی دیکەدا
دە بانگخوازی گەنجو... سەرسپی هەیە
هەموو حزبو شاعیرێکو بانخوازێك
خەریکی شەڕە پەڕۆیە
بەتەنها خۆی لا راستگۆیە
چۆن راستی بدۆزینەوە
لەناو ئەم هەموو درۆیە...

جیاوازی تۆ و - تۆڕ-
یەك- رێ- یە

تۆڕ ماسی دەگرێ
تۆ:
من

ئەگەر لەخەو هەڵسایتو

دوو شاباڵت لێ رووابوو بەراستی نەك بەخەون

لەخۆت بایی مەبە

نەوەك شاباڵەکانت

مۆم

یا

سەهۆڵ بن...

چونکە بەخوێنی دڵیان

دەینووسن

سوور سوورە شیعری:

عاشقان

ئەگەر منداڵێکی

برسیت دی

بۆی مەگری

فێری بکە چۆن راپەڕێ

چەك هەڵگرێ

دژی ئەو دەستە زۆردارەی

کەنانەکەی

ئەو دەدزێ

ئەگەر پەنجە هەر نەشبوایە
لەسەر دارو گوڵو بەردی
نیشتمانم
شیعرم بۆتۆ دەنووسی
بەزمانم...

بەهارە پێت پەتێکە... بەهارە
رقی لەترپەی پێڵاوە
گوڵ

ئاخری هەمووومان
دەکات بەرۆبنسن کرۆسۆ
عەشقی نیشتمان...

# پۆلێك بالندەی یاخی

چەند میهرەبانە
لە کەژاوەی رەشەبایەکدا
دەڕواو دادەپۆشێت
تەرمی خوێناوی شەهیدێك:
پەڕەیەکی سپی

چەند جوانە لاپەڕەیەکی سپی
ئەگەر تیادا نەنووسێ
ستایشی دکتاتۆرێك:
شاعیرێك

سەهۆڵن سەهۆڵی زستان
با هەتاو دەرکەوێ
دەتوێنەوە؛
پاڵەوانەکان

لەو ڕۆژەوە گەردوون بووەوە بە گەردوون
پشیلە عاشقی مشکەو
مشك ڕقی لە پشیلەیە
هەر ئەمەیە
کێشەی هەبوونو
نەبوون

لە وشە زۆر
کەرەستەو پێداویستی ناوماڵ
دروستدەکرێ
کورسی... ئەسکوێ
تیرۆکو تیرو کەوان
قۆناغە تفەنگو شەکردان
پەنجەرەو ڕەوڕەوەی منداڵ
سندووقی بۆراقی جۆراوجۆر
سێدارە بۆ دیکتاتۆر

# ترس

**پەنات بۆ دێنم لەشەیتان نا**
**لەشەوەو لەشەولەبان نا**
**لەبەفرو ....رەشەبای زستان نا**
**لەدرۆی درۆزنو فرتو فێڵی بازرگان نا**
**لەشمشێری ژەهراوی رەخنەگران نا**
**لەبوومەلەرزەو گڕکان نا**
**لەوشکە ساڵی بێ باران نا**
**لەکۆبوونەوەکانی**
**ئەنجومەنی وەزیرانو**
**پەرلەمانی کوردستان**
**خوایە گیان**

# شیعری کاریکاتێر
# بازرگان

هەموو بازاڕەکان گەڕان

خامۆ بلووری دەستنەکەوت

بیناڵێنن .. لەشەهیدێکی نیشتمان

تومەز بەرپرسێکی گەورە

هەرچی خامۆ بلووری بوو

هەمووی لەبازاڕ کڕی بوو

بۆخۆی کردبووی بەگیرفان

چاڵە نەوتێکی دزی بوو

تیادا بردی بۆ هەندەران...

# دوو گۆشە نیگای جیاواز

سەیر نەبێ لەلات شەوێك

لەپێو پێڵاوی مرۆڤ و

تایەی ئۆتۆمبێلەکانو

سێبەری ئەپارتمانەکانو

دوو کەڵی تفەنگەکانو

درۆی سیاسییەکانو

شیعری شاعیرەکانو

فڕوفیشاڵی پاڵەوانەکانو

پەڕۆو پاتاڵی ریکلامی حزبەکان

بێزار بێزار ببێو

بفڕێ بۆ ئەو دیوی ئاسمان؛

زەوی

# گۆڕستانی سەوزە گیا

بەشی باخچەیەکی نەهێشتەوە

دوو کۆترو دوو عاشق

ئێوارانێك سەوزە گیای پیاسەیەکی

تیادا بچێنن

هەموو زەوی کرد بەگۆڕستان:

نەوت

# شیعرگەلێکی
# بێ ناسنامەو نیشتمان

من
من
من
من
من
من
من
من
من
من... پێکهاتووم لە:
(م. ن)

بەشی درووستکردنی
یەك وشەی نوێ ناكات
هەزاران هەزار:
فەرهەنگ

شاعێرێتی و چەتەگەری
وەكو ژیانو مردن
جمكن

چەتە رێبوارەكان
رووتدەكاتەوە
شاعیر
فەرهەنگەكان

واهەست دەكەم ئەوەی لەسەر كاغەزەكاندایە
تەنها تارمایی شیعرە
جارجار دیارە وەك تەمو مژ
جاربەجاریش دەتوێتەوە هەر وەك بەفر
هەمیشە لەناو تاریكاییەكانی دڵدا
خۆی دەشارێتەوە:
شیعر

هەربەجلوبەرگە کۆنەکانیو
پێڵاوە دڕاوەکانی یەوە بەجێیهێشتین:
ساڵی رابوردوو

بووە بەسەیرانگاو
جێی حەوانەوەی میوان
گۆڕستانی:
شەهیدان

* * *

لەبێ دەنگیو
لەراوەستان
بێزار نابێ:
کێو

لەراکردنو
هاوار هاوار
بێزار نابێ:
رووبار

بابیانژمێرین
لەجیهاندا دڕكو داڵ
زۆرترە
لە گوڵ

# دروستکردنی
# وشە لەئاگر

چەند بێ ناز لەقوتووی عەتارەکاندا

کەوتووە...

چەند نازدارە بەسنگی کچێکەوە:

قۆپچە...

هەزاران شاعیر خەو بەوەوە دەبینن

دەستیان ببێ بەقۆپچەیەك

لەسەر سنگی:

کچێك

بەهەزاران درۆو دەلەسە
دەگاتە سەر كورسی پەرلەمان
پاڵێوراوی حزبێك...

بەبێ هەرا هەرا لەسەر لووتكەی
مەمكی كچێك دەنیشێتەوە:
پەپوولەیەك...

دەبێ مانگی بەچەند مژ
بەسەر تیشێرتەوە
پاسەوانێتی مەمك بكات:
قۆپچە...

ئەگەر داو و تەڵە
لەمووی پرچی كچان درووستبكرایە شاعیری راو دەكرد
لەبری:
باڵندە...

شاعیران خۆیان ئەڵقەكەیان لەمل دەكرد
ئەگەر لەپرچی كچان بچنرایە:
سێدارە

جیاوازی ژێی كەمانچەو تاڵەكانی پرچت ئەوەیە
ژێی كەمانچە ئاوازی لێ دەبارێ
پرچت:
جێ پەنجەی من

سێو چوار مانگ
بەقولاپی دووکانێکەوە شۆڕبووەوە
هەر نەگەیشتە سەر سنگی ژنێك
بەمشکێکی گوت:
چیدی بەرگەی چاوەڕوانی ناگرم بمخۆ:
ستیانێك...

لەدووکانی هیچ عەتارێکدا
سەرنجم ڕاناکێشێ
بەڵام کە بەلێوی کچێکەوە دەیبینم
حەز دەکەم هەموو جەستەم
ببێ بەزمانو بیلێسمەوە:
بۆیەی قەڵەملێو...

دوو کۆتری ئاشتیخوازن
هەزار گازم لێ گرتوون
تووڕە نەبوونو دەنوکێکیان لێ نەداوم:
مەمکەکانت

شەرم دەکا
هەورێکی رەش رەشی
کردووە بەسوخمەی
مەمکەکانی خۆی:
چیا...

چونکە هەمیشە لەبرسا
بەدوای خواردندا رادەکا
کۆلیسترۆڵی زیاد ناکا؛
پشیلە...

دوو حکوومەتی جیاوازی
لەجوغزی خۆی دا کۆکردۆتەوە
بەبێ هیچ یاسایەك:
هێلکە...

بەفوویەك بەرد دەکەی بەدار
بەنیگایەك لمستان دەکەی بەڕووبار
ئەگەر بەڕاستی یەك جار
سوژدە ببەی بۆ کردگار...

جەستەیەکی رووتو قووتو
وشکو زڕە
بەبێ بیرەوەری تۆ:
من

باران نیە... خوێنی شەهیدەکانە
لەو چیاو گێوانە
بووە بە:
کانی...

ئێوە ئەمڕۆ درەختەکان
دەکەن بەسێپای قەنارە
سبەی ئێمە درەختەکان
لەهەموو گەڕەکو کۆلانێ
بۆ پەپوولەو منداڵ دەکەین بەجۆلانێ

ئاگادار بە... گوێ بگرە
لەوانەیە لەدیواری ژوورەکەتدا
سیخوڕی بکات:
پەنجەرە...

بەگوێ دەمان بینێ
نابینا
بەچاو دەدوێ
لاڵ...

رقی لەماسێکانی خۆیەتی
بەڕاوچی یەکانی دەفرۆشێ
دەریاچەی:
دووکان

پەڕەی هەزارو یەک گوڵ
هە
ل
و
ە
ر
ی
خەندەی مانگ توایەوە
چرای ماڵی ئەستێرەکان خامۆش بوون
هێشتا بەدوای شیعرێکی ونبوودا
سەرگەردانە:
شاعیرێک...

کات
وەک -با-
لەدەستمان رادەکات

درێژترین شیعرە
رووباری:
خەم

# گەڕان
# بەدوای شیعردا

رەنگە زۆرجار لەجەنگەڵێکدا
هیچ شتێك جوانتر نەبێ
لە:
خاڵخاڵۆکەیەك...

بەمنداڵی لەسەربانی باڵەخانەکەمانەوە
تۆپێکم هەڵدا بۆ هاورێیەکم لەوڵاتی کاکێشان
نەهاتەوە بۆلامو لەشەوی ئاسماندا
بوو بەمانگ

ڕەنگە هەموو تەمەنم
بەدوای شیعرێکدا بگەڕێم
کەبێ ڕەنگو بێ دەنگە
دەشێ
ئەو شیعرە هەر نەبێ
دەشێ بێ گەڕان بۆ ئەو شیعرە
هیچ خەونێکی تیادا نەژێ
ئەم سەرە...

لەخەومدا
هەردوو وێڵ بووین
لە جوغزی بیابانێکدا
لم گڕی گرتبوو... بەهەتاو
تۆ...... تینووت بوو
تینوو.. تینوو
من بووم بە: ئاو

بەفر بەسەر لووتکەکاندا
دادەبارێ
بەسەر مەمکەکانتدا
پەنجەکانم...

گرەو دەکەم... گرەو
لەتۆوە فێربووە
پرچی خۆی
ڕەش... ڕەش... بکات:
شەو...

چراکان بکوژێنەوە
با مانگو ئەستێرەکانی شەوی چاوت
هەڵبێنو بدرەوشێنەوە...

ئەمشەو هیچ چرایەك هەڵمەکە
با ئەستێرەکانی چاوت
ببینم...

منداڵ لەباوەشی دایکی دا
گەورە دەبێ
لەناو دەمی عاشقدا؛
مەمك...

دەڵێی پەپوولەیە
بەهەزار باڵ هەڵدەفڕێ
لەشەپۆلی بای پایزدا؛
گەڵا...

خۆشترین میوەی هەرچوار وەرزەکەیەو
هەرگیز کۆن نابێ:
ماچ

هەموو شتێك لەناو بەفردا
دیارە
جگە لە:
گوڵی سپی

# بارانی پەپوولە نەناسراوەکان

**هەر کە گوێی لە جیروهوڕی**
**گالیسکەی پایز دەبێ**
**ئیتر خۆی دەکوژێ:**
**گوڵ**

**هەر خۆی تێر بێ لە ئاو**
**باکی نیە گەر هەمووومان**
**بەتوینێتی بپوکێینەوە**
**دەریاچەی،**
**دەربەندیخان...**

کەوتە خوارەوە
لەدەمی
کچێك
کەوتە ناو دەممەوە
پشکۆی:
ماچێك...

لەسەر سنگی کچێکەوە
خۆی هەڵدایە
خوارەوە... رێك...
کەوتە
ناو دەممەوە:
گۆی مەمکێك

حاجی لەقلەقەکەی لەخەو هەڵساند
لەسەر منارەی مزگەوتەکە
دەنگی:
بانگخوێن...

دایکت گوێ لەوشەکانت دەگرێ نم نم
گوێ بۆ بێدەنگیت شل دەکات:
دڵم

کێ دەڵێ پرتەقاڵێکی گەورە نیە
شێتێك هەڵی نەداوە بۆ ئاسمان
مانگ

هەتاکو دوور نەکەوێتەوە
نازانین چەند خەمڕاکێشە دووری؛
یار...

کپیو هێوری شەویان
هەڵوەراند
دوو عاشق بەگڕی؛
ماچێك

بەسەوزەگیاو گوڵی رەنگاو رەنگو نازدار
شیعرە دڵداری یەکانی خۆی
بۆکام دۆستی دەنووسێ:
بەهار

پەلەیەتی... پەلە..... دەڕوا بۆ لای یار
لەهیچ شوێنێ
سەرخەو ناشکێنێ
لەهیچ ئاواییەك پشوونادات:
رووبار

ئەوە کێ تووڕەی کردووە
هەڕەشە لەکێ دەکات
وا زەوی بەر ئار بی جی دەدات؛
هەور

درەختی درووستکرد
خودا
هێلانەی لەسەر درەخت چنی
باڵندە
درەختی کرد بە دەسکی تەور
مرۆڤ
بوو بەدوژمنی هەموو دارستانەکان
تەور

بیر لەوە دەکاتەوە کەپرێك
لەئاوریشمی تیشکی خۆر
بۆ خۆشەویستەکەی بچنێ؛
شاعیرێك

دوێنێ شەو دوو منداڵ
لەدایکبوون لەدوو ماڵ
پێدەکەنین وەك دوو خۆر
کامیان دەبێ بەجیڤاراو
کامیان دەبێ بەدیکتاتۆر...

شارەزای گشت ڕێگاکانە
هەر چاوەڕێم بێت و دەستم بگرێ و بمبا
لەبەردەرگای ماڵەکەیاندا بەجێمبێڵێ:
ڕەشەبا

دووبارە
لەدایکبوومەوەو گەڕامەوە بۆ ناوەندی سەدەی بیست
کەتۆم خۆشویست...

وای بۆ دەچم لەرەگەزی ماسی بێ یا قرژانگ
ئەگینا بۆ هەموو شەوێ
لە ئاوێنەی رووبارەکاندا دەخەوێ:
مانگ

چەند شیعرێکی
کورت
کورتم
بۆ نارد
کەبانگی کردم بۆ ژوورەکەی
لەشیعرەکانم زۆر.... زۆر
زۆر... زۆر
کورتتر بوو:
تەنوورەکەی...

نازانم بڵێم کامیان جوانەو
کامیان لەوی دییان جوانتر
بەڵام زۆر لێکدی دەچن
گوڵو
شیعر

شەونم دەموچاوی بۆ دەشوات
با لەجوڵانیی کاتدا
رایدەژەنێ وەك گۆرپەیەك
تا دەپشکوێ؛
خونچەیەك

نەپرسیار دەکات
نە وەڵامی هیچ پرسیارێك دەداتەوە
هەر پێدەکەنێ:
گوڵ...

دوو شت پێکەوە هەڵناکەن
گوڵو
دڕك
دووشت لێکدی بێزار نابن
دەمو مەمك...

دوو کەس بۆ مەمکی ژنێ
دەگرین... لەماڵێك
شاعیرێكو
منداڵێك...

ناوێرم وێنەی مەمکت
لەهیچ شوێنێ... بکێشم
ئەگەر تاریکە شەو بێ
ئەگەر بارانی زۆر زۆر
لەسەر لووتکەکانی دا
پێدەکەنێ...
خۆر

پێی پیادا مەنێن
مەمکی زەوی یە
ماچبارانی کەن:
لووتکە

تۆ ژماردن نازانی
مەڵێ:
منو
تۆ
بڵێ: من
بڵێ: تۆ
ئێمە یەکێکین نەك:
دوان

دەڵێی بۆ ئەوە درووستکراون

بەپرسەنامەی هاوڕێکانمان

خۆیان بڕازێننەوە...؛

دیوارەکان

جاران مرۆڤ هەر لەسەر زەوی دا

دەژیا

کوردی فێری ژیانی ژێر دەریای ئیجە کرد

شەڕ

# ئەستێرە
# نزیکە نەبینراوەکان

سالەکانی تەمەنمی

تۆزقاڵ بەتۆزقاڵ

لەگەڵ خۆی دا برد... شەمەندەفەری:

وشەو خەیاڵ

لەو ماڵەدا هەموو جارێ چەند فرمێسکێك

دەکات بەسەر چیلکەی ناو ئاگردانەکەدا

لەبری نەوت:

دایکێك

کەدەچێ بۆ قوتابخانەی ئەو گوندە هەموو ساڵێك
جووتێ کیسەی نایلۆن دەکاتە پێی
لەباتی پێڵاو:
منداڵێك

دەڕۆم وەکو سەرگەردانێك
جانتایەکی گەورەم داوە بە کۆڵمدا
هیچی تیادا نیە جگە لەتەرمی:
نیشتمانێك

دوێشەو جووت بوون... باو هەور
منداڵێکیان بوو سپی سپی
خەڵك ناویان لێنا:
بەفر

عاشق نیت
گەر جیاوازی نێوانی
پشکۆو مەمك بزانی

ئاسمانیش بەزستان
کە سەرمای دەبێ
پەتۆیەك بۆخۆی دەچنێ
لەپەمووی:
هەور

عاشق نیت
گەر گومڕاو باوەڕدار
وەکو یەك نەبینیت...

عاشق نیت
گەر جیاوازی نێوانی
گوڵو دڕك
بزانی...

عاشق نیت
گەر جیاوازی نێوانی
خوداو شەیتان بزانی

عاشق نیت
نا عاشق نیت
ئەگەر قووڵایی دەریاو
بەرزایی چیا
وەکو یەك نەبینیت...

عاشق نیت
گەر گومڕاو باوەڕدار
دۆستو نەیار
وەکو یەك نەبینیت...

هەمیشە عاشقێك گۆرانی دەڵێ:
بەڵام ئێمە گوێمان لێ نیە
چونکە ئێمە عاشق نین...

بەچاوی دڵ بڕوانە
دڵۆپە فرمێسکێکی چاوی
عاشقێك
قوڵترە لە:
دەریایەك

کە عەشقت دۆزییەوە
نە پایزت دەوێ
نەبەهار
هیچت ناوێ جگە لە:
یار

ئەو کاتە پێکەنی... گەردوون
کەسۆفیێکان بەعەشقی خوا
مەست ... مەست... مەست بوون

گەر وەکو شێخی گەیلانی
لەنهێنی عەشقی خودام دەزانی
بیابانم ئاوس دەکرد بەکانی

دمریام دەکرد بەبیابان
هەموو کێوەکانی زەویم
بۆ برسێکان

دەکرد بەنان
ئێمە دڵمان پڕ گریانەو
کەچی بەدەم پێدەکەنین
ئێمە ئاسمانمان تاریکەو
کەچی وێنەی خۆر دەکێشین...

گۆڕی پێمانە
گۆڕی پێمان
پێڵاو

جۆلانێی جلوبەرگە
جۆلانێی جلو بەرگ
تەناف

بۆ وا سەوزە
رەنگە نیگایەکی چاوەکانتی بەرکەوتبێ
دارستان...

بنوون... بنوون
ئەی نا عاشقەکان... بنوون
ئێوە بەزیندوێتی؛
مردوون...

کاتم نیە... نیە... نی
رقم لەهیچ کەسێ بێ
وەها سەرقاڵی کردووم
خۆشەویستی

ئاگرمان لەکوێ دەهێنا
ئەگەر خودا
دڵی پڕ نەدەکردین لە؛
عەشق

ئەگەر عەشق نەبوایە
نەختێ مێوو تاڵە دمزوویەك بوو مۆم
چۆن دەیتوانی بەئاسایی
رابماڵێ تاریکایی...

ئەگەر عەشق نەبوایە
کێ ئاوێنەکانی چاومانی
پاك دەکردەوە لە:
فرمێسك...

لەناو شەپۆلی رەشەباکاندا
پەپوولەو پەڕەی گوڵو
گەڵای دار... ریز ریز
لێکدی دەچن:
پایز

تاشەبەردێك لەو تاریکاییەدا
نووستووە
جار جار ماچی دەکات:
مانگ

لەنێوانی ئەمڕۆو دوێنێدا
یاری بەئەستێرە دەکات:
شەو ...

کاتەکانی هەر پێنج نوێژەکە دەزانین
دەزانین کەی باران دەبارێ
دەزانین کەی کاتی مووچە وەرگرتنە
دەزانین کەی رەمەزانە
دەزانین کەی جەژنە
بەڵام نازانین
لەدەوروبەرماندا چەند چۆلەکەو
چەند سەگو پشیلە برسین...

رقیان لێیەتیو هەرکە دەرکەوت
خۆیانی لێدەشارنەوە
مانگو هەتاو و ئەستێرە:
هەور...

ئەوسا عاشقی کەنەزانی
تۆ خودای... یا:
خودا تۆیە...

ئەوسا عاشقی نە.. هەست:
بەبوونی خۆت بکەی
نەنەبوونت...

ئەوسا عاشقی... نەبزانی
کەی خۆرهەڵدێو
نەبزانی کەی ئاسمان:
پڕ پڕ دەبێ لە ئەستێرە...

ئەوسا عاشقی جیاوازی
نێوانی
دەریایەکو
دڵۆپێ ئاو:
نەزانی...

چیت داوە لەمانگو هەتاوی ئاسمان
دڵی خۆت پڕاو پڕە لە:
مانگو
هەتاو...

کەی عەشقت دۆزییەوە
نەخودات پێویستە
نەشەیتان
کەی عەشقت دۆزییەوە
شەیتان خۆی دەگوژێو
خۆت دەبی بەخودا....

چیت داوە لەخودای ئەو دیوی ئاسمانەکان
لەئاوێنەی دڵی خۆتدایە:
خودا...

لەهەر کوێ بی
کەچرای عەشقت هەڵکرد
دەگەیتە بەردەرگای
ماڵی خودا

عەشق نەبوایە هەرگیز
نەخەندە لەدایك دەبوو
نە فرمێسك...

دەستم بگرە
بۆ وڵاتێکم بەرە
نەخەندەی تیابێ نەپەنجەرە
نەفرمێسکی گەدا
نەدیوار
نەبیابان نە رووبار
نەشەیتان... نەخوا
شنەبا...

شەرم لەمانگ دەکەن
بەتەمو مژ
مەمکەکانیان داپۆشیوە،
کێوەکان...

لەدوای کیمیابارانەکە
لەهەڵەبجەدا بوون بەگوڵ
زامی؛
شەهیدەکان...

پێم بۆ کوێ بمبا
تۆ لەوێ دیاری
نازانم... من... نا
تۆ یەکێکی یا
سەدان هەزاری...

# ریز

ئێمە وەچەی وڵاتی ریزگرتنین

بۆ نان کڕین

ریز دەگرین

بۆ دڵۆپێك نەوتو بەنزین

ریز دەبەستین

کەبۆ سەفەرێك دەچین

لەتەرمیناڵ ریز دەبین

دوو سێ مانگ جارێ کەدەچین

چارەکە مووچەیەك وەربگرین

لەیەك ریزی درێژ درێژدا دەوەستین

تەنانەت کاتێك دەچین

لەمزگەوتێك دەستنوێژ بگرین

ریزێ درێژ دەبەستین

بۆ گشت شتێك یەك ریزینو

ریز دەبەستین

بەڵام لەرووی دوژمناندا سەد ریزین

هەر ریزێکمان بۆ رێیەکی جیاواز دەچین

# رەشنووسێکی سپی سپی

ئەگەر رۆژێ خەم مۆڵەت وەرگرێ

بۆ وڵاتێکی دوور دوور بڕوات

دەبێ شادی چ لافاوێك درووستبکات

ئەگەر ساڵێك مەرگ مۆڵەت بخوازێو

بڕواتە دەرەوەی گۆی زەمین

چۆنی بەرگەی ئەو هەموو ژیانە بگرین...

* * *

# عاشقانی خودا

ئەوەی عاشقی خودا بێ
نەتامەزرۆی بەهەشتەو
نەلە دۆزەخ دەترسێ
نەعاشقی کورسی پەرلەمان دەبێ...

# دڕندە

دڵۆپێک
با
را
ن
سەد هەزار دڵۆپ
ملوێنێک
هەزار ملوێن
ملیارێک
هەزار هەزار
ملیار... ملیار... ملیار... ملیار
ملیار... ملیار... ملیار
دڵۆپ
با
را
ن
لافاو...
شارێکی:
وێران

# نووسین لەسەر دڵ
# بەئاگری عشق

من تازە بۆم دەرکەوتووە
هەموو دەریاو رووبارەکان
لە چاوتدا هەڵدەقوڵێن
ئێستا هەستم پێکردووە
هەموو گوڵە نازدارەکان
بەلیسکی خەندەی تۆ دەڕوێن
من تازە بەوەم زانیوە
گشت شیعرێکم
نەختێ جوانی تۆی دزیوە

**من تازە بۆم دەرکەوتووە**
**کەلاسایی خەندەی دەمی**
**تۆ دەکاتەوە هەتاو**
**ئێستا هەستم پێکردووە**
**هەر خاکێك تۆ... لێ ی نەپژێنی عەتری هەنگاو**
**نەگوڵی تیا دەڕوێ... نەئاو...**

**خوشكو برای یەکدینو**
**هەر رادەکەن بەلۆژە لۆژ**
**کەس نازانێ بۆچی هەرگیز**
**لەسەر یەك خوان نان ناخۆن:**
**شەو... و**
**رۆژ**

**بەبێ باکی پێ ی پیا نەنێ ی**
**بۆنی خوێنی سەرپەنجەی**
**دەیان کچی بێ باوكو ژنی رەشپۆشی لێ دێ**
**دەزووی سووری**
**هەموو:**
**فەرشێك.**

**وردە وردە**
**بەسەوزە گیاو بەگوڵی رەنگامە**
**بۆ مەمکە رووتەکانی زەوی**
**ستیانێکی**
**وەك پەلکەزێڕینەی چنی:**
**هەور**

هەر خەونی ناخۆش ناخۆش دەبینێ
لەبەر ئەوە
خەونەکانی بۆ کەس ناگێڕێتەوە:
دکتاتۆر

ئێستا تاشەبەرد بەلووتکەدا
سەر ناخات
خۆری داوە بەشانیدا
تاریکایی پێ راو دەنێ:
سیزێف

عاشقە شەو تا بەیانی
فرمێسك بۆ مەرگی خۆی
دەبارێنێ
د
ە
با
رێ
ن
ێ
مۆم

میراتی دارستانەکانە
لیرە هەلڕژاوەکانی:
خەزان

یادگاری چای ڤاچاخچیو شوانەکانە
لەو گێوانە:
خۆڵەمێش

بەندیخانەیەکە لە ئاسن
ئەم گەردوونە
بەبێ:
ژن

هەموو رێگاکانی من
بۆ لای تۆ دێن
لەمن دوور دوور دەکەونەوە
هەموو رێگاکانی:
تۆ

هەتاکو ناو دۆزەخەکەی هنری باربۆس
کەمەندکێشم دەکات
بۆنی شوێن پێی
کچان

رەشەبا درەختەکان
رووت
رووت
دەکاتەوە
دەستەکانی من:
تۆ

هەموو بەرەبەیانێ
لەچەمەکەی پشت ماڵماندا
بەرووتی مەلە دەکات:
مانگ

من دەڵێم ئەستێرەکان
مەڕو بەرخن
مانگیش:
شوان

ئەمە نهێنییەکە... کەس نایزانێ
جگە لەخۆم
وشەکانم شەوان یەك... یەك
لەبەر پەنجەرەی کچێکدا
دەبن... بە:
مۆم

ئەی عەشق راستە من کۆیلەی تۆم
بەلام شاهەنشای عاشقان
هەر خۆمم...
خۆم...

جارجار لەترسی داعشو تالیبان
هەور بۆخۆی
دەکاتە سەرپۆشێکی
هاودامان:
مانگ

که من هەم... گرنگ نیە
تۆ ببیت
یا نەبیت
من تۆمو
تۆ:
منیت...

پڕاو پڕم لەگوناحی رەش رەش
رووت رووت دەبمەوە
سپی سپیم بکەرەوە
بەبارانی؛
ماچ

بەداو و تاپڕ
پیاوان لەم بنار و لەو باسک
راودەکەن کەو و کۆتر
کچانیش پیاو راودەکەن
لەم شەقامو لەوی تر
بەمەمك

بۆ لای تۆ لەو لووتکانە
دێتە
خوارەوە لەپڕ
بە
ف
ر

دڵنیابە... دڵنیا
تاتۆ نەبینیێ
ئارەزووی پیاسەی سەر زەوی ناکات:
سەوزە گیا

چەند بەخشندەیە
ئەو هەموو گوڵەمان دەداتێو
خۆی یەك گوڵ
بەپرچە درێژەکەیەوە پێناکەنێ:
هەور

ئێمە نایبینین
ناوجەرگەی هەموو دڵۆپە ئاوێك
پڕاو پڕە لە:
گوڵ

دوو دڵدار بوون
هەزار ساڵ پێش ئێستا
نازانم کام دیکتاتۆر
لێکدی
دوور
خستنەوە:
مانگو
خۆر

چاوم لێ یە لەو بڵندایی یەوە
لەئێوارەوە تا بەربانگ
هەر سەرنجی مەمکی کچۆڵەکان دەدات؛
مانگ

دووشت پێکەوە
هەڵناکەن گوڵو
دڕك
دوو شت لێکدی بێزار نابن..
دەمو مەمك

گوێ بگرن... هەواڵێك... هەواڵێك
بۆ مەمکی ژنێك دەگرین
شاعیرێكو
مناڵێك

بەشەویش ناوێرم.. نا..نا
وێنەیەکی مەمکت لەسەر
تاشەبەردێکی دڵم... هەڵکۆڵم
لەناکاو
لەجەرگەی تاریکیدا
لەسەر لووتکەکانیدا
پێدەکەنێ سەدان هەتاو...

پێی پیادا مەنێن
مەمکی زەوی یە... ناسکە
ماچبارانی کەن؛
لووتکە

ئەگەر وەرزەکان
کۆچو رەوبکەن
لەپڕ
دەبێ ئیتر
گوڵ لەچ کاتێکدا بڕوێو
کەی لووتکە داپۆشی
بەفر

# ناونیشانە
# بێ ناونیشانەکان

لەگەڵ خۆممەو
لەگەڵ ئەومەو
لەگەڵ ئەممەو
لەگەڵ تۆ
کورسی یەکی
شڕو هوڕی
چاخانەی شەعب و مچکۆ
بڵندترە لەهەر هەموو کورسێکانی
پەرلەمانو ئەنجومەنی وەزیران
کەچی خوێنی یەکدی لەسەر دەڕێژن
خودا نەناسو
موسڵمان

کە زاوزێ دەکات
هەر گوڵی ڕەنگاو ڕەنگی دەبێ:
بەهار

هەر چوار وەرزەکە
بەجوانی یەك گوڵەوە شانازی دەکەن:
دەمت

خەندەی عاشقەکانە لەپڕ
لەتوێی دوو بەردداا
قوڵپ دەدا:
ئاگر

کەشەو دێم بۆ لات
خەندەیەکم بۆ هەڵکە
نەك:
چرا

جاران کەسێك دەمرد
ئێستا شارێك
کەدەلورێنێ:
سەگێك

بەسەر گوڵدا دەبارێ
ئاونگ
بەسەر لقی داردا... پاچ
بەسەر لێودا...
ماچ

لەباخێکدا ویستم گوڵێك
بکەمەوە لەچڵێك
بۆتۆی بێنم

دەستم بۆ هەر گوڵێك دەبرد
شێوەی هەر لەتۆی دەکرد
ئاخر چۆن تۆ بقرتێنم

سەرانسەری گوڵستانە خامۆشەکەی
لێوانلێوکرد لەپەپوولەی تەمو گریان
ترپەی هەنگاوی گوڵێك
کەکەوتە خوارەوە
لەچڵێك...

گەڵای درەختەکان
عاشقی مەرگن
لەسەر هەموو لقو چڵێکەوە
خۆیان
هەڵدەدەنە
خ
و
ا
ر
ە
و
ە

ریز... ریز
بۆ پێشوازی لەپایز...
کەی منداڵی یەك شەوە
بێزار بوو لەشیری؛
دایکی
منیش بێزار ئەبم لە؛
تۆ...

بێ ئارایشت سەرنجڕاکێشە
گوڵ
بەخشڵەوە... جوان نیە ژن
بەژنەوە جوانە؛
خشڵ

جلەکانمان؛
بەئاو دەشۆین...
بەگوناحی رەنگاو رەنگ:
دڵی بێ خەمو پڕ خەممان
بەبڵێسەی ماج:
دەممان

تەنیا هەر ئەو لقە درەختەی شکاند...
کەبەچکە چۆلەکەیەك بەتەنیا
یاری دەکرد لەسەری دا:
رەشەبا...

# دەرزەنێك
# وشەی لەهەور دروستکراو

دەستنوێژی نوێژ بەئاو دەگرم
دەستنوێژی عەشق بە:
ماچ

پێکەنینی دیوارە،
پەنجەرە

تۆ رووت رووت بووی وەك دەمی پاچ
وەکو درەختێکی وەرزی خەزان
من جەستەتم داپۆشی بەهەوری:
ماچ

ئەوەی خۆشە بۆمن
بیری لەتۆ تیا دەگەمەوە؛
ئێشکگرتن...

ئەوەی خۆشە... بۆمن شەو
جارجار تۆی تیا دەبینم بە؛
خەو

کەسەرنجی دەدەمێ
لە ئاوێنەی ئاسماندا بەپەنجە ئاگرینەکانی هەر
وێنەی تۆ دەکێشێ؛
هەور

ئەگەر عاشق نەبێ
چۆن لەو بەرزاییەوە... وا بەتاو
خۆی دەهاوێتە خوارەوە؛
سۆلاو

جەستەیەکی رووتو رەجاڵەو چڵکن
بەبێ بیرەوەری یە جوانەکانی تۆ:
من...

بەهارە... بەهار
شەمەندەفەری شەپۆلەکانی خۆی
ئاوس دەکات بەماسی:
رووبار

بۆ لای کام یار
وا بەلەنجەو لار
بەدەمی پڕ لەتریقەی  پێکەنینەوە
دەڕوات:
رووبار

لەبیاباندا وەك گوڵی جوانو ناسك
ناز بەسەر لمدا دەکات،
دڕك

تەنها هەریەك شت...
هەریەك شت رەقترە
لەپۆڵاو تاشەبەردو ئاسن
دڵی:
ژن

هەموو زستانێك
دەبێ بەزێوانی کڵێسا
هەر زەنگ لێ دەدا:
هەور

ئاوێرن ئاشکرای بکەن بۆمان
پڕە لەخەونی مینرێژ کراو
ژێر سەرینی:
مندالەکان

بەشەهیدەکانییەوە...
زیندووەو جوان
نیشتمان

کۆمەڵێ بەردو خاك نین
خوێنو یەسقانی شەهیدەکانمانن؛
لووتکەکان

تەماشای گەی بەچاوی دڵ
لەناو سەرە نوێلکیشدا
هەر گوڵە؛
گوڵ

جاران بۆ هەموو کەسێك چ گەدا چ مەزن
هەریەك جار بوو
ئێستا لەهەر خولەکێکدا
سەد جارە:
مردن

من پێم خۆشە سەرگەردان بەو ئاوارە
بەدوای نیشتمانێکدا
نەنەوتی تیابێ... نەپارە
نە ئەم هەموو دیکتاتۆرو زۆردارە

بێ دەنگ بە... بێ دەنگ بە
بێ دەنگن چی بەردو دارە
خەریکی تار ژەنینە... ئەو:
رووبارە

تەماشاکە... تەماشاکە
سەهۆڵبەندانەکەی خۆی
کردووە بەئاوێنە بۆ مانگ:
لووتکە

چۆن رۆژو شەو دەتوێنەوە... وەکو سەهۆڵ
لەدەفری نەبینراوی کاتدا
بەو جۆرە لەرووباری یادگەمدا
وەك دەنکێ لم
وێڵە:
دڵم

درندەیەو وەك ئەردۆغان دوژمنی کوردە
دەریاچەی:
ئیجە

کەس نازانێ بۆ هەموو ساڵێ
هەموو لیرەکانی خۆی رست رست ریز ریز
بەرەشەبا دەبەخشێ:
پایز

هەموو ساڵێ چاوەکانی خۆی
دەگرێ لەهەورو باران
گەڵای فرمێسك هەڵدەوەرێنێ
رەنگە گوناحەکانی زەوی بشواتەوە،
ئاسمان

لێکدی دەچن بەخۆڕسك
دەستیان بۆ ببەی
دونیایەك وێران دەکەن
نارنجۆلکو،
مەمك

مامۆستای جوگرافیا چی دەڵێ بابڵێ
زەوی هەر دوو لوتکەی تیایە،
مەمکەکانت

مامۆستای جوگرافیا ئازادە چۆن دەدوێ
بەڵام زەوی هەر دوو دەریای تیایە،
چاوەکانت

بەر لەهەزاران هەزار ساڵ
هەنگوین... تاڵ بوو... تاڵ... تاڵ
بۆ شیرین کردنی
وشەیەکی منی دزی،
هەنگێك

دو بەرد لێك بدەم
ئاگر دەبارێ
لێك بدەن دوو دەم
گوڵی ماچ دەڕژێ
وەکو رووبارێ

فرمێسکی عاشقانە
بەسەر گوڵەوە:
شەونم

رەشەبایەك لقی درەختێکی شکاند
لەدڵی خۆیدا گوتی: من چەند قورسم:
دڵۆپە:
شەونمێك

لەهەر چوار لاوە دوژمن
گەمارۆی داوین بەئاسن
ئێوەش لەسەر کورسی یەك
یەکدەکوژن...

کەبرسێتی تەشەنە بکات
خۆی لەکێلان دا بۆ ڕاناگیرێ:
شمشێر

که زەبرو زەنگ
ڕۆژ تاریك...دەكات
وەك شەوە زەنگ
دێنە دەنگ
هەزارو یەك؛
تفەنگ

ئەو هەر نەهات بۆ لای من
تۆ وەرە ئەی خەو
بەڵكو جارێ بیبینم؛
بەخەون...

# پێڕێك شیعری
# مینیجۆبو میکرۆجۆب

خەوی لێ زڕاندووم بە: زیکەزیك
کێ دەڵێ لەدووری دڵدارەکەی ناناڵێنێ
زیکزیکەیەك

لەسەر سەرتدا هێلانە دەکەن
ئەگەر بزانن عاشقی
هەزار هەزار:
پەپوولەو باڵدار

بریتی یە لە:
پێنج ئۆقیانۆسو
شەش کیشوەرو
هەندێ خەمو
سەدان شیعر:
من

کە ئاسمان بەجێدێڵێ بەرەبەیان
دەڕوا لەشەقامێکی شارێکی بێ نەخشەدا
دەبێ بەکچێکی جوان،
مانگ
* * *

کەدوای زەڕدەپەڕ
ئاسمان چۆڵ دەکات لەناکاو
دەڕوا دەبێ بەپرچی کچێکی نەناسراو:
هەتاو

بەشی شکۆفەکردنی
چرای عەشقێك ناکات
چەند درێژ بێ تەمەن

کەتۆ پێدەکەنی
گوڵ شەپۆل دەدات
بۆیە گەماڕۆت دەدەن:
پەپوولە...

کەلەنیشتمان بێزار دەبم... دەڕۆم
لەسێبەری دڵی کچێکدا
دەشارمەوە:
خۆم

کەهەڵەکات لەبەر دەرگاکەتاندا
حاڵی عەشق دەمگرێ
لەبەر دەرگاکەماندا ڕۆدەکا
خاکی جێ پێکانت:
با

بەئاوازی شمشاڵێك
تەنیایی گوندێکی تەراند
دوێنێ شەو:
شوانێك

دەساڵ شوانێتی بەموسا کردو
پێغەمبەرایەتی لەبیر بردەوە...
عەشقی:
کچێك

* * *

کەهات جێگۆڕکێی
بەهەموو شتەکان کرد
رەشی کرد بەسپی
سپی کرد بەڕەش
راستی کرد بەدرۆ
درۆی کرد بەراستی
ناسیاوی کرد بەنامۆ
نامۆی کرد بەناسیاو
خودای لەلا کردین بەئیبلیس
ئیبلیسی لەلاکردین بەخودا:
نەوت

رۆژێ دادێ لەزەوی دا جێ نامێنێ
وەکو جلو خاولیو پەتوو
بەتەنافدا هەڵدەواسرێ:
تەرمی مردوو...

ئەگەر خەو ببینێ لەخەوی دا
هەرچی لقی درەخت هەیە
دەیکات بەتاپرو
هەرچی زیخو چەو هەیە
دەیکات بەساچمەو
دەینێ بەدڵی مرۆڤەوە:
کەروێشك

لەهەزار ئارایشتکاری سەرنجڕاکێشترە
بەسەر لێوی کچێکەوە:
خەندەیەك

پارشێوانی جارانو ئەوسا
چەند خۆش بوو
بانگیان دەکردین
لەخەو هەڵسین:
دەهۆڵو
زوڕنا

هەموو دڵۆپە ئاوێك
دەریایەکی بێ پایانە
لەلای:
مێروولە

بەم زستانە گەرمایەتی
خۆی لەبەفر گرتووە
ئەو:
کێوە

گوێ بگرن... گوێ بگرن
هەواڵێك... هەواڵێك
لەیەکەوە... تاوەکو دە
بەپەنجەکانی دەژمێرێ:
منداڵێك

چاوم لێ یە بەشەو... وەك بەرخۆڵە لەم گردو لەو هەرد
سەوزەگیای ناو چیاکان دەخوات:
بەرد

ئەو دزەیە
کەهیچ شوێن پێ هەڵگرێك
نازانێ بۆ کوێ دەڕوات:
با

هەزار هەزار چاوی هەیە
هەزار هەزار
کەمرۆڤ دەبینێت رادەکات:
رووبار

پێنج شمشاڵی پێوەیە هەموو:
دەستێك:

هەزاران چاو کەمەندکێش دەکات
بەسەر سنگی کچێکەوە:
قۆپچەیەك

هەمیشە لەبازنەی ئەوینێك دەردەچین
بۆ ئەوەی لەجوغزی عەشقێکی دیکەدا
ون ون بین...

**وەکو دەرزی و دەزوو**

**هاوڕێی یەکدی بوون،**

**تۆو من**

**زمانیان لاڵ بووە**

**هەر بە لوولەی تفەنگ**

**گۆرانی دەڵێن،**

**پیاوان**

**شەوێ ئەوەندە گریا**

**هێندە فرمێسکی باران**

**دەسکە گوڵی بەدەزووی رەنگاو ڕەنگ چنراوی**

**سەر بەرگی سەرینەکەی بوو بەچەپکێك**

**گوڵەباخو ئەرخەوان**

**عاشقێك...**

**ئەم نیشتمانە بۆ ئێوە بەجێدێڵمو**

**دەڕۆم...**

**بەدە دوازدە وشەی نوێ**

**نایابترین نیشتمان دروستدەکەم**

**من: بۆ**

**خۆم**

جارێکیان هاوڕێتی زستانم کرد
مەست مەستی کردم
بەبۆنی:
گوڵ:

جارێکیان دوژمنایەتی پایزم کرد
دایپۆشیم بەتەرمی:
سەوزە گیا

لە ئێستاوە هەموو رۆژێك
کاتژمێرێك کات
پاشکەوت دەکەم لەسوچێکدا
بۆ ئەوەی بەپیری پڕیان بکەم
لە:
ئێستا

دیکۆر
دیکۆر
دیکۆر
هەموو شتێك دیکۆری دەوێ
تەنانەت گۆڕ
جگە لە:
ماچ

وەکو تەنوورەکەت
کورت
کورتی
دەکەمەوە؛
شیعرم

وەکو پرچەکەت
درێژ
د
ر
ێ
ژ
د
ر
ێ
ژ
د
ر
ێ
ژی
دەکەم
شەپۆلی
خەمم

سەرنجی پرچت دەدەم
بزانم
دەتوانم
بەرماڵێکی لێ دروستکەم
نوێژی عەشقی لەسەر بکەم...

با بیانژمێرین... لەزەوی دا
گۆڕ
زۆرترە لە:
ماڵ

با بیانژمێرین
لەبەهاردا
دڕك زۆرترە لە:
گوڵ...

هەزار تەن تاریکایی
رادەماڵی... یەك:
چرا

# عەشقنامەی شاعیرێك
# کە پیر دەبێو پیر نابێ

هەزار ساڵە عاشقمو هەر نەمتوانی چرای عەشقێك
بنەفرێنم بۆ سەودا سەرانی هەتاو
هەزار ساڵە عاشقمو هەر بۆم نەلوا فەرهەنگێك
ئامادەکەم... دەربارەی دڵدارانی... گومناو
هەزار ساڵە ئەکتەری شانۆی ئەوینم... نەکرا جارێك
عەشق بۆ هیچ نابینایەك بکەم بەچاو
هەزار ساڵەعاشقمو هەر نەمتوانی عەشق بکەم
بەچرایەك بۆ ماڵێکی بەتەم گەمارۆ دراو
هەزار ساڵە وانەی عەشق دەڵێمەوەو هەر رێنەکەوت
بۆ گوڵێکی تینوو تینوو... عەشق بکەم بەقومێ ئاو
ئێستا سەرمەستی ئەوەم عەشق بکەم بەئاگر
گڕ لەم جیهانە بەردەمو درووستبکەم جیهانی تر
خۆ من تازەم زانیوە... هیچ رەشەبایەك هەڵناکات

هەتاکو تۆ تووڕە نەبیت
هیچ بارانێك دەنووك لەزەوی نادات
هەتاکو تۆپێنەکەنیت...

خۆ من تازەم زانیوە... پایز ناگات بەهیچ داریٚ
یەك گەڵایەك زەرد نابێتو لەلق نایەتە خواریٚ
هەتاکو خەم لەدڵتدا هەڵنەقوڵیٚ وەك رووباریٚ

خۆمن تازەم زانیوە
مێشەنگ تامی هەنگوینی
لەلێوی تۆ دزیوە

هەموو دڵدارانی جیهان
لەمنەوە فێری وانەی ئەوین بوون
هەموو خەمبارانی جیهان
لەمنەوە فێری زاری و گرین بوون
لەوشەکانی منەوە... پەنجەرەکان
فێری خەندەو پێکەنین بوون

لەوشەکانی منەوە هەورو باڵدار
فێری زمانی فڕین بوون
لەشیعرەکانی منەوە کانیو رووبار
فێری لەنجەو هەڵقوڵین بوون
وشەی هەموو شاعیرەکانی جیهان
لەپیتەکانی منەوە
فێری وانەی ڕاپەڕین بوون

من نازانم تەمەن بۆ کام
شارو هەواری بردووم
چ زوو... چ زوو
سپی بوو
وەکو پەموو
ریش‌و مووم
خۆ من ئەو ڕۆژەی تۆم ماچ کرد
لەدایك بووم...

کەلەپەڕەیەکدا دەنووسم
تۆم خۆشدەوێ
هەزاران گوڵ...
لە ژێر خامەکەمدا دەڕوێ

کە لە دڵی خۆمدا دەڵێم
تۆم خۆشدەوێ
هەزاران خۆر

لەئاسمانی ژوورەکەمدا دەپشکوێ...
تەنیا منم سەرکردەی
عاشقانی هەموو دونیا
گەر من نەبم
عەشق تەنیایەو تەنیا

چونکە من تۆم خۆشدەوێ
بەشەو هەتاو لەبەر پەنجەرەکەم دەنوێ
چونکە تۆ منت خۆشدەوێ
پەپوولە دێن بۆ ژوورەکەم

لەگەڵ سەدان ئەستێرەی نوێ
رۆژێ هەموو هەورەکان
بەقەرز دەکرِم لەئاسمان
دیلیان دەکەم لەجانتایەکی ئاسندا
با لەمەودوا نەبەفر بباری نەباران
با هەر خەندەی تۆ داباری
بەسەر جەستەو دڵی مندا...

لەوەتی تۆم خۆشدەوێ
برِۆم بۆ کوێ
هەزاران گوڵ
لێرەو لەوێ
دوام دەکەوێ...

حاجی بەدەوری کەعبەدا
دەخولێتەوە
بەدەوری بازنەی مەمکتدا،
دەمم...

* * *

هەتاکو ناو توونی دۆزەخەکەی هنری باربۆس
کەمەندکێشم دەکات
بۆنی شوێن پێی کچان

# دەستەوارەیەك شیعری
# مینیجۆبو میکرۆجۆب

هاوینم دێنێتەوە یاد

بینینی:

حاجی لەقلەق

گوندە سووتاوەکەمم

بیر دەخاتەوە

بەرز بوونەوەی:

دووکەڵ

کەس نازانێ... کەس...
لەکەیەوەو کێ
لەسەر باڵای ئا ئەو دارە بەڕووە
نووسیویەتی:
خۆشتم دەوێ...

پەڕەی دەفتەری یادگاریەکانمان
دەکات بەجگەرەی
پیرەژنێك کەناونراوە:
ساڵگار...

نازانم تۆ بووی
لەخەونمدا ماچت دەکردم یا:
پەرییەك...

بەددانە ئاسنینەکانی
هەموو شەوێ
ونجڕ ونجڕم دەکات
دووری:
تۆ

ئەو هەر نەهات بۆ لای من
تۆ وەرە ئەی خەو
بەڵکو من بڕۆم بۆ لای ئەو
بەشەمەندەفەری:
خەون

رۆژێ هەموو هەورەكان
دەدزم لەئاسمان
دەیانخەمە جانتایەكی ئاسنەوە
با ئیتر
نەبەفر
بێت بۆ ماڵتان
نەگوڵو
نەباران...

دەڵێی موغناتیسە
هەر دەرگەوم
رامدەكێشێ؛
جەستەت...

سەرنج بدەن
ئەوە باران نیە دەبارێ
خوێنە...
خوێن...
خوێنی عاشقەكان

لەزەوی‌و لەئینجانەدا
گوڵ دەڕوێ
لەدڵمدا
خەم دەپشكوێ...
* * *

بینینی قورئانو
تەزبیحو بەرماڵ
دایکمم دێنێتەوە
یاد...

ئێستاش ئەگەر بیهەژێنی
بۆنو بەرامەی گوڵی
ماچەکانی تۆ و منی
لێ دەبارێ لقی شەوی؛
مەڵکەندی....

من عاشقی مانگێکم
بەمنداڵی لەئاسمانی سەربانەکەماندا
هەورێك لێ ی دزیم
ئێستا لەچاوتدا
دۆزیمەوە

# زینده خەونەکانی عاشقێکی نامۆ

کەس نازانێ
باڵندەو ئاسمان
بۆهێندە
ناکۆکن
* * *

کەس نازانێ
مەڕو گورگ
بۆ ئەوەندە
تەبان
* * *

کەس نازانێ لەسەرچی
زستانان
ئاسمان
لەسەر کام گوناحو تاوان
زەوی دادەتە بەر تیری باران

هەر بەو دەستە بەدەستنوێژەم
کەقورئانی پیرۆزی
پەر پەڕ پێهەڵدەدەمەوە
ئەڵقەریزی ستیانەکەی
دەکەمەوە
بەناوی خوا دەست پێدەکەم
سوورەتی گۆی مەمکەکانی
دەخوێنمەوە بەپەنجەو دەم
* * *

خۆی لەملت ئالآند بوو ملوانکەیەك
نەموێرا بڵێم خۆزگایە
مووروویەکی ملوانکەکەی
تۆ بوومایە...

کەحاڵی عەشق دەیگرتین
دەبووین بەیەکێك هەردوکمان
من تا ئێستاش بەگومانم بەگومان
منوتۆ یەك کەسین
یاخود... دووان...

تۆ داهێنەری رووتبوونەوەی
تەنها لەتۆ دیّ رووتبوون
درەختەکانی پایز
یەك یەك... ریز ریز
بڕ
بڕ
جوون
جوون
هەر هەموویان لەتۆوە
فێری خۆ رووتکردنەوە بوون...

کەدرەخت رووت دەبێتەوە
هاودامانی خۆی پڕ دەکات
لەپەپوولەی زەردی بیّ دەنگ
کەتۆ رووت رووت دەبوویتەوە
ژوورەکەت پڕاو پڕ دەکرد
لەبەفر و گوڵی رەنگاو ڕەنگ

* * *

سەرانسەری گوڵستانە خامۆشەکەی
لێوان لێو کرد لەتەمتومانی گریان
ترپەی پیّی گوڵێك
کەکەوتە خوارەوە لەچڵێك

شەو لەخەوما دوو کۆتری سپی سپی
لەناو ناودەمما نیشتنەوە
ناخەونەبوو راستی بوو
مەمکی تۆ بوو... کەی کۆتری سپی بوو...

کەدیداری یەکدیمان دەکرد بەزستان
ئاگرەکانمان دەکوژاندەوە
ماچمان دەکرد بەئاگردان

نازانێ چۆن گەڵاکانی هەڵدەوەرێ
هیچ دارێ
منیش نازانم تۆ چۆنی
لەلقی دەستم وەریتو
لەپڕ کەوتیتە خوارێ

لە باخێکدا ویستم گوڵێک
بکەمەوە لەچڵێک
بۆتۆی بێنم
دەستم بۆ هەر گوڵێک دەبرد
شێوەی هەر لەتۆی دەکرد
ئاخر چۆن تۆ بقرتێنم...

ئەگەر ستیانەکەت بگوشن
گەردوون پڕاوپڕ دەبێ
لەلافای ماچی من

من ناتوانم بتچوێنم لەهیچ شتێ
تۆ هەر تۆیتو نەتۆ لەهیچ شتێ دەکەی
نەهیچ شتێ لەتۆ دەچێ

من کردم بەپەیکەرێکی
هارو هاج
تاشەبەردێک بوو
تۆ
* * *

فێری دروستکردنی
گوڵی پێکەنین بووم
خۆم
فێری هۆنینەوەی
فرمێسکی کردم
من
* * *

دەشێ
لەبنی دەریاشدا
بیابان هەبێ...
* * *

بۆ هەر کوێ رابکات... هەزارجار
هەر دەکەوێتە
ناو گەرووی دەریاوە
رووبار
* * *

دەتوانێ هەزاران
ئاسمان‌و
هەتاو و
گوڵەگەنم... و مژو تەم
دروستبکات
قەڵەم
* * *

وشە حەز دەكات
رەها بێ لەوەتی لەدایك بووە
كێ ئەم هەموو بەربەستەی
لەرێگاكەیدا چاندووە...

* * *

لەوەتی هەیەو بووە
باڵندە حەزی لەئاسمانە
بۆچی ئەم هەموو قەفەزەیان
بۆ دروستكردووە...

* * *

كە شیعر دەدۆزمەوە
خۆشی ونەدەكەم
كەخۆشی رووبەڕووم دێ
شیعر
بەجێمدێڵێ
درۆیە
خۆشیو شیعر
جمك نین...

* * *

بەفر رێگا دوورو درێژەكان دەخوات
كینە
شتە جوانەكان...

* * *

# یادەوەرییەکانی
# شەوی یەڵدا

بەمنداڵی پرچە رەشە درێژەکەی
دایکم... شەوی یەڵدام بوو
چوار وەرزەی ساڵ
بۆ خۆم کردبووم بە ڕەشماڵ
دایکم چراو خودام بوو

کە وردە وردە هەڵچووم
عاشقی کیژۆڵەیەك بووم
رووباری پرچە رەشەکەی

بوو بەشەوی یەڵدای شیعرم
حەزم دەکرد لەقوڵایی
ئەو شەوە زەنگەدا بمرم
کە گەورە بووم
کەبەچاوی شاعێرێتی
روانیمە مێژووی رابوردووم
ئەوسا زانیم لەوەتی دونیا دونیایە
لەشارە بچکۆلەکەمدا
هەر تاریکیو هەر شەوی درێژی یەڵدایە
من گشت شەوێ ئاهەنگی یەڵدا دەگێڕم
شەوی یەڵدای ئەم وڵاتە دوایی نایەو
دوایی نایە...... و دوایی نایە...

# وشەکان
# بەبێ باڵ دەفڕن

ئاونگی ئاسمانی عەشقە
بەناو دەمدا دەبارێ
ماچ

ڕۆحی شەهیدەکانمانن
لەئاسماندا بوونەتە
ئەستێرە

لەبیرم دێ
چەندێ خۆش بوو بەمنداڵی
بەپێدز کێ

دەڕۆیشتین هەنگاو هەنگاو
بەچنگ تووڕمان دەدایە ناو
مەقەڵیو کوورەی ژوورەوە... لەناکاو
دەتەقییەوەو ناو ماڵی
پڕ دەکرد لەهەراو هوریاو
ئەوە کێ بوو... وای کرد کێ
دەنکە خوێ

وردە وردە بەسەوزە گیاو گوڵ
ستیانێکی رەنگاو ڕەنگ
بۆ مەمکە رووتەکانی زەوی دەچنێ
هەور...

تاریکایی چەند ترسنۆکە
مردار دەبێتەوە
بەهەڵکردنی
چرایەك

نەهیچ بەڵگەنامەیەکی فەرمیم پێبوو
نەنامەیەکی حافزی شیرازی
نەپەنجە مۆرێکی مەولانای رۆمی
خەندەیەکت دەستی گرتمو
کردمی بەمامۆستای فێرگەی
عەشق

فرمێسکی خودایە
شەوان بەسەر گوڵو درەختدا دەبارێ
ئاونگ
دەبێ بۆ کێ بگری
خودا

هەمیشە پەلەپەتی
چاوەڕێ ناکات ئێمە لەخەو هەڵسین
بەبێ دەنگی بەجێمان دێڵێ
مانگ

بەبێ بایەخی بەلای دا تێنەپەڕن
پۆستەچی چەندین کوڕو کچی عاشق بووە
پەنجەرە

لەمۆزەخانەیەکدا
دڵداری لادێی بیرخستمەوە
چیخێك

نازانم لەو سەهۆڵبەندانەدا لەسەر ئەو لووتکانە
بۆچی دەگەڕێ
مانگ

لەهەتاو پێویستترە
بۆ راماڵینی تاریکای دڵمان
چرای لێوی کچێك

گەلقی درەختەکان دەکەونە هەڵپەرکێو سەما
دەڵێ ئەوە منم:
رەشەبا

کەبا تێدەپەڕێ... وەختو ناوەخت
هەموو دەستەکانی خۆی بۆ دەکات بەچەتر
درەخت

لەدەرەوە هەر ڕاکەڕاکێتی
چی لێ ون بووەو بەدوای چیدا رادەکا
رەشەبا

بەلەدایکبوونی گوڵێك
ئامازە بۆ لەدایکبوونی خۆی دەکات
بەهار
بەمردنی گوڵێك
شیوەنی خۆی دەکات
پایز

بەئاوی زەمزەم نا
بەئاگری ماچی دڵداران نا
بەخەمی دایکی شەهیدان نا
بەسووتووی نوشتەو نزای
بەزەعفەران نووسراوی ناو ئاوی کوڵە چوارشەم نا
بەمەرەکەبو تەم نا
بەخوێنی دڵی خۆی
نەمرترین داستانی عەشقی نووسی
خاتوو:
دوعا

یەکسانن... یەکسان
وەك یەکن... وەك یەك
وێرانکردنی جیهانو... هێلانەی
چۆلەکەیەك...

یەکسانن... یەکسان
چوونیەکن... چوونیەك
کوشتنی هەموو جیهانو
لەتۆپەت کردنی
جەستەیەك

کەبەهار هات
لەبیابانێکدا داوێك دەنێمەوە
راو دەکەم نەختێ
کات

ئێستاش کەبیری لێدەکەمەوە
مەست مەستم دەکات
یادی یەکەم
ماچ

لەیەکەوە دەست پێدەکات
هەزارو یەك
ماچ

کێ دەڵێ برینی عاشقەکان نین
گوڵ

چۆن جێی ئەو هەموو گوڵە جوانە
دەکاتەوە لەمنداڵدانی خۆی دا
بەهار

زەوی کە دەکەوێتە ژان
یا بوومە لەرزەی دەبێ... یا
گڕکان
هەڕەشەی لێکردم
هەر رەنگی رەشم لەلا جوان بێ
چاوت

هەمیشە لێم یاخی یەو
هەزار شەڕو ئاژاوە لەدڵمدا
هەڵدەگیرسێنێ یەك لەدوای یەك
وشەیەك

گەر بمەوێ هەمیشە
سەدان هەزار هەتاو
لەئاسمانی ژوورەکەتدا
درووستدەکەم... بە:
وشە

گۆرانی یەکی بێ دەنگ
لەسەر دیواری دڵم هەڵدەکۆڵێ بەهەزار رەنگ
برژانگت...

کەتۆ دێی بۆ ژوورەکەم
بەمۆڵەت دڵم چۆڵ دەکات
خەم...
***

# درووستکردنی
# باخ بە: وشە

هەزار ساڵە بەهەزار باڵ هەڵدەفڕم
سەدان هەزار ئاسمانو ڕێگام بڕیوە
هەر ناگەمو... ناگەم... بەو کچە پەری یەی
بەمنداڵی خەندەیەکیم... هەڵمژیوە

تاڵەکانی پرچت...
ژێی ژیانم
کەمانچە ژەن
پەنجەکانم

خەندە لەتوێی لێوەکانیدا نەماوە
بووە بەئینجانەی چقڵ
لەوساوە
کەتۆی لێ دزراوە
دڵ

بەیەك فیشەك هەڵدەگیرسێ
ئاگری شەڕ
بەپریشکێك هەموو گەردوون دەسوتێنێ
خەندەی؛
عەشق

خەندەیەکتم پێببەخشە
با هەرچەند مانگ ئاوا ببێ
لەئاسماندا بیکەم بە:
مانگ

وا رەشەبا هەڵدەکات مەشلەژێ
گەلاو گوڵی جوان... دەومرێ
وا بۆنی ترپەی پێی عەشق دێ
چاوەڕێکە... هەر کە گەیشتە ئێرە
تاوەکو ناو- باخچە- کەی مارگرێت دوراس
دەستت دەگرێ...

من نەمەم دەناسم... نەزین
چاوت یەکەم قوتابخانەی
عەشقمە

وەك رووخاندنی حەمامۆکێی منداڵیتی
ئاسان نیە
رووخاندنی؛
دڵێك

زریکەی زەوی دەبینم
لەژێر پێڵاوەکانمدا
بەگوێی:
دڵ

کەلە هەموو شتێکدا
بەقسەی خۆتت کرد
دەبی بەدیلی
خۆت

***

# دیلێتی

لەیەکەم رۆژی بوونییەوە... دیلە
بەدەڵەمەیی دیلی ناو ورگی دایك
بەکۆرپەیی دیلی جۆلانێو بێشکە
لەسەرەتای منداڵێتی دا
دیلی: دایەنگەو باخچەی منداڵان
بەمنداڵیو
هەرزەکاریو
لاوێتی
دیلی: قوتابخانەو گوزگیو شانەو
زانکۆ

بەگەورەیی دیلی: حزبـو
کورسی فەرمانگەو دراو
بەپیرێتی دیلی؛
بەر دەرگای بانقی خانەنشینی
بەمردوێتی دیلی؛ گۆڕ
لەگۆڕدا دیلی: ژێر دەستی خوا
ئیتر بۆ ئەوەندە چەقاوەسووە
هەر باسی ئازادی دەکات؛
مرۆڤ

# پاڵەوان و
# شتی دیکەش

بۆ ئەوەی ئاوریشم لەبەرکەین
دەبێ سەدان ملیۆن کرمی ئاوریشم
دەرخواردی ئاوی گەرم بدەین

بۆ ئەوەی شیعرێکی جوان بنووسین
دەبێ سەدجار بەپاچینەی یادگارماندا
سەربکەوین و
دابەزین

دەبێ وەکو ڕۆبۆت بین
نەهەستمان هەبێ نەویژدان
بکوژینو خوێن بڕێژین...
تا پێمان بڵێن:
پاڵەوان

کە زاوزێ دەکات
هەر گوڵی دەبێ
بەهار

# ئەفراندنی پەپوولە بەدڵۆپی مەرەكەب

سەگێك دەلووڕێنێ
نازانم كێ دەمرێ
بۆنی ترپەی هەنگاوی باران دێ
نازانم چەند گوڵ دەپشكوێ
بۆنی گڤەی ڕەشەبا دێ
دەزانم چەند ملوێن گوڵ
د
ە
و
ە
ر
ێ

ناچارین لەتەنیاییدا هەموو وەختێك
دەبین بەهاورێی سێبەری
درەختێك...

ئەو باڵندەیە بەچنگ زەوی هەڵدەکۆڵێ
بۆ دۆزینەوەی دەنکە:
گەنمێك
ئەو شاعیرەش دڵی خۆی ژێروبان دەکات
بۆ راوکردنی:
پەیڤێك...

خەمو شادی لەخۆت داماڵە لەناکاو
دەبی بە:
هەتاو

رقو خۆشەویستی لەخۆت داماڵە یەك جار
دەبی بە:
رووبار

بوێری و ترس لەخۆت داماڵە دڵنیابە... دڵنیا
دەبی بە:
چیا

خەندەو گریان
دوێنێ و ئەمرۆ لەخۆت داماڵە
دەبی بە:
دارستان

بەچاوی دڵ سەرنجی خودا بدەی

مزگەوتو

کڵێساو

بتخانە

چوونیەکن

بەچاوی دڵ سەرنجی شتەکان بدەی

چوونیەکن

مرواریو

چەو

بەچاوی عەشق بڕوانیتە شتەکان

چوونیەکن

گوڵو

دڕک...

بەچاوی دڵ لێ ی بڕوانی

وێنەی دەیان لاسو خەزاڵی

تیا دەدۆزیتەوە

کانی

ئیفلاتوون گووتی: یەکسانن
مەرگو ژیان
گوتیان کەوایە بۆ خۆت ناکوژی
گوتی : خۆمن
نەمگوتووە لەژیان خۆشترە...مردن

نەڵێی تەکیو خانەقاکانی جارانە
لەدوورەوە خەڵك کەمەندکێش دەکات لەدێوشار
بەدەنگی تەپڵو دەف نا
بەرەنگی گوڵ
بەهار

# پۆلە پەپوولەی خەونە ئەلەکترۆنی یەکان

دارستانەکان قژو کاکۆڵی خۆیان
بەهەزار چنگ
دەڕنن
لەگیانەڵادایە:
بەهار

ئەوەك خۆر ئاوا دەبێ
ئەوەك مانگ دەتوێتەوە
هاوڕێی هەمیشەیی زەوی یە:
با

دۆش داماوم چۆن
ئەو هەموو پەپوولەیە کەمەندکێش دەکات
چرایەك

کەس نازانێ... نەمن نەتۆ نە ئێوە نەئەو
بۆچی هەزاران ملیۆن ساڵە
بەبێ وچان یەکدی راو دەنێن
رۆژ... و
شەو

سەدان ملیۆن ساڵە
هاورێی مرۆڤەو
هەر پیر نەبووە:
مەرگ

ئەگەر هەستت بەهاتوچۆی
کچێکی ئەو دیوی پەنجەرەکەت نەکرد
دڵنیابە  دیلی کردوویی:
پیرێتی

گرەو دەکەم کەس نازانێ
بۆ کێ دەگری
هەور
یابۆ کێ پێدەکەنێ بەهار

هاتوچۆی مزگەوتو
کڵێساو
بتخانەش دەکات
دەمارگیری ئاینی تیادا نیە،
هەتاو

بیابانێك دەڕازێنێتەوە:
درەختێك

هەر بۆنی یەسقان دەکات
لەناو هەزاران گوڵدا،
سەگ

کەلە پاڵ سەوزە گیادا بڕوێ
گوێدرێژێك لووشی دەکات:
گوڵ

پێکەنینی هەورە:
چەخماخە
رۆحی مردۆکانمانن
بۆیە لەماڵەکانماندا هێلانە دەکەن
پەڕەسێلکە

کوڕو کچی زەوین
دارستانو
شارەکان
دەبێ دەستلەملانێ ی
چەند عاشقی ببینێ ئەو پیرە،
داربەڕووە

زۆر لێکدی دەچن،
ڕەشەباو
شەمەندەفەر

هەر بەناو ئەو هەوارە کۆنانەدا دەگەڕێ
ڕەنگە وێڵگەردی مزگەوتێکی دێرین بێ
نوێژێکی تیادا بکا
با

ئەگەر هاتی بۆ لام
یەك گوڵم بۆ بێنە... یەك گوڵ،
دەمت

منداڵێك بەقەڵەمبۆیاخ
وێنەی بۆمبایەکی نیترۆنی
لەناو باخێکی بەقەڵەمبۆیاخ دروستکراودا
کێشا
تەقییەوەو باخەکەی وێران کرد کەخۆی پیادا کێشا،
پەپوولەیەك

دوای هەموو شەڕێك
پێشبڕکێ لەگەڵ هەموو
جلێکی ڕەنگاو ڕەنگدا دەکات:
جلی ڕەش

بەبێ پرس
بەبێ ترس
دەچێتە ناو  ژووری هەموو
دیکتاتۆرێکەوە:
تاریکایی

هەزار ساڵە لەم وڵاتەدا دەژینو
بەڕێوەبەرایەتی باری شارستانی
ڕەگەزنامەیان ناداتێ:
پەپوولە

کێ دەڵێ فڕۆکەی دەوڵەتێکی
نەناسراو نین:
ئەستێرەکان

داستانی سەد عاشقی لەدڵدایە
هەموو:
گوڵێك

ئێمە وردە وردە
پیر دەبین
هەمیشە گەنجە:
عەشق

# راکردن
# بەدوای هەوری خەوندا

کپی‌و هێوری
شەویان شڵەژاند
دوو عاشق بە:
ماچێک

ئەوە کێ تووڕەی کردووە
هەڕەشە لەکێ دەکات
وا زەوی بەر ئاربی جی دەدات:
هەور...

تاكو من واژۆی خۆمم لەسەر دیوانەكەم
بۆ بەجێهێشت
ئەو لێوەكانمی مۆركرد بە:
ماچ

چەند دڵی خۆشە
لەناوسەهۆڵبەنداندا
كرمێكی دۆزیوەتەوە:
باڵندەیەك...

شەرم لەمانگ دەكەن
سەرپۆشیان پۆشیوە:
كێوەكان...

تاشەبەردێك
لەو تاریكاییەدا
نووستووە... جار جار
ماچی دەكات:
مانگ

گاڵتە بەمیهرەبانیو نەرمو نیانی
مەكە
گەر تووڕە بێ
بەپەنجە درێژ درێژەكانی
ملی كێو دەشكێنێ:
ئاو...

## سزا

ئەو دەستانە مەبڕن

بۆ ئەوەی لەبرسا نەمرن

پارووی نان دەدزن

ئەو دەستانە بهەنجنن

بەهاتو هاوارو چەپڵەی زۆر

گورگێك دەكەن بەدیكتاتۆر

* * *

# هێلانە

چەندین ساڵە هەڵۆیەك

لەسەر لقی درەختی رووی فستانی

ئەو کچە نیشتۆتەوەو هەڵنافڕێ

بشێ لەوێدا مردبێ

یا هێلانەیەکی بۆخۆی سازکردبێ

# پەیکەری نەبەزین

هەرچی وشەی زێڕین هەیە
هەرچی وشەی پۆڵاو ئاسنین هەیە

هەرچی واتای گڕو ئاگرین هەیە
چی تریفەی مانگی گەشو زیوین هەیە

چی ئەستێرەی ئاسمانی جوانو شین هەیە
هەرچی تاشەبەردێکی خوێنین هەیە

هەرچی عەشقو ئەوین هەیە
چی جوانی سەر زەمین هەیە

لەسەر لووتکەی قەندیلو هەندرێندا
لەسەر هەزار ترۆپکی بەرزو بەفریندا

هەمووی دەکەم بەپەیکەری نەبەزین
بۆ کچانی پاڵەوان و شەیدای ئازادی عەفرین

# جانتایەك شیعری
# مینیجۆبو میكرۆجۆب

چۆن رۆژو شەو لە دەفری كاتەكاندا

وەك سەهۆڵ

دەتوێتەوە

بەو جۆرە لەرووباری

یادگارمدا

وەكو: لم

وێڵە:

دڵم...

لە توێی لێوی تۆدا شکۆفە دەکات:
هەتاو
لەناو پرچەکەی تۆدا هەڵدەقوڵێ:
شەو

سەرنج بدەن
گەڵای درەختەکانی ئەو دارستانە
دانە... دانە
لەسەر لق و تەرزو چڵەکانەوە ریز ریز
بۆ پێشوازی وەرزی پایز
خۆیان
هەڵدەدەنە
خ
و
ا
ر
ە
و
ە

لە خەومدا
لێکدی دوور کەوتینەوە...
ئەوا ئێستا کەوتوویتەتە باوەشمەوە
کامیان راستیو
کامیان: خەوە...

جێی کەسی دیکەی
تیادا نابێتەوە
پڕاوپڕە لەتۆ:
دڵم

جاری وا هەیە گەوهەرێ
بار دەکرێ
لەگەرێ...

بتانەوێ و نەتانەوێ
هەموو سەدەیەك پڕ دەکات
لەئاژاوەی ئاگرین:
باکۆنین...

ئەگەر رۆژێ لەرۆژەکانی هەفتە
دوابکەوێ
دەبێ چی سزایەکی بدات:
مانگ

بەهەمنگوای بڵێن
ئەی پیرەمێردی دەریاکان
بانگەشەی جەنگ دەکەن:
زەنگەکان...
* * *
فرمێسکی عاشقە گومناوەکانە بەسەر درەختەوە:
شەونم

گەر لەبەهاردا سەرنج بدەی
لەدێڕە شیعرێکی بەخوێن نووسراو دەچێ؛
لقی گوڵەباخ...

کەشەو دێم بۆ لات
خەندەیەکتم بۆ هەڵکە
نەك چرا...

خەندەی عاشقە شەهیدەکانە
لەتوێی دوو بەرددا
قوڵپ دەدا؛
ئاگر...

هەزار مزگەوت
بسوتێنە
سەد جار کەعبە
بڕووخێنە
بەڵام لێکدی
دامەبڕە
دوو عاشق...

# وێنەیەکی
# کاریکاتێری

لەگوندێکی دەشتی گەرمیان

چاوی منداڵێك دایە ژان

بۆ لای گەلێ نەخۆشخانەو پزیشك برا

چارەنەکرا

پیرەژنێکی لێزان

گوتی ئەگەر چاوی تکێ

نەوتی سپی تێنەکرێ

ژانی ناشکێ و کوێر دەبێ

هەموو گوندەکان گەڕان

کفریو کەلاریان پشکنی

تا پیوازو دەربەندیخان

دڵۆپێ نەوت

هەر دەستنەکەوت

یەکێکیان بۆ ئێران نارد

تا نەوتەکەی هێنایەوە

منداڵەکە چاوی بەتاریکی سپارد

* * *

## سێ دیمەنی جیاواز

هەوری پۆشیوە
گوناحەکانی زەوی
بەفرمێسك دەشوات:
ئاسمان...

باوێشکی لێ دەبارێ ئێوارە
ئیتر خۆیان رووت رووت دەکەنەوە:
ئەستێرە

بڕوانن سەدان تافگە
لەو کێوانەوە
خۆیان بۆ باوەشی گوڵ
هەڵدەدەنە
خوارەوە:
بەهار

# دەسبازی لەگەڵ وشە ئاگرەکاندا

لەسەری کەوتە خوارەوە

کەبە پەنجە بۆم شانە کرد

دەستکردبوو...

قژی

لەتوێی لێومدا بەجێما

کەچاویم رامووسی:

دەستکردبوو...

برژانگی

گۆرانی یان لەیاد نەماوە

زمانیان لاڵ بووە

هەر بە لوولەی تفەنگ

لەگەڵ یەکدی دا

دەدوێن:

پیاوان

دایکو باوکیان لەیاد چۆتەوە

بوون بە کوڕو کچی دایەنگەکان،

منداڵان...

کەئێمە دەنووین

هەموو بەرە بەیانێك

دەکەوێتە ناو رووبارێکەوە:

مانگ

ئەستێرەکان مەڕو بەرخن

چەند هەزار ساڵە لەو بەرزاییەدا

دەیان لەوەڕێنێ:

مانگ...

سوێند دەخۆم یار
لەوەتی تۆم خۆشویستووە
زووتر لە دایك دەبێ:
بەهار...

دوێنێ ئێوارە تووڕە بوو...
بە شمشێرە درێژەکەی
سەری هەموو درەختەکانی پەڕاند:
ڕەشەبا...

ئێمە نایبینین
ناو جەرگی هەموو تنۆکە ناوێك
پڕە لەخەندەی گوڵ...

چەند بەخشندەیە
ئەو هەموو گوڵە ڕەنگاوڕەنگەمان
دەداتێ
خۆی یەك گوڵ
بەپرچە درێژەکەیەوە نیە:
هەور...

ئاسمان پڕە لەبەرخۆڵە
بەگۆچانێکی زەردی درێژەوە
بووە بەشوان:
مانگ...

دایکم دەیگوت دوو دڵدار بوون لەشارێك

لێکدی دور دووری خستنەوە:

مانگو

خۆر...

زۆردارێك...

پێتان دەڵێم زوو بێ یا دێر

کەبرسێتی تەشەنەی کرد

لە کێلاندا خۆی پێ راناگیرێ:

شمشێر....

بۆ گوڵرێژکردنی ژێر پێی:

تۆ

لەو لووتکانە رادەکاتە خوارەوە

هەور

بۆ سەرنجدان لەجوانی تۆ

لەژێر زەوی سەردەردێنی:

سەوزە گیا...

# بەر لە عەشق
# هیچ شتێك بوونی نەبوو

کەی بەر لەوەی عەشق بدوێ
گوڵێکی هەبوو بەهار
کەی بەر لەوەی عەشق بگری
ئاوی تیادا هەبوو رووبار

کەی پێش پێکەنینی عەشق
ئاسمان مانگو ئەستێرەو هەتاوی هەبوو
کەی بەر لەوەی عاشق ببین
زەوی گڕو زێڕو کانیاوی هەبوو

کەی بەر لەوەی عەشق مەمکت واخرِ بکات
لووتکەو گردو شاخو کێو و چیا هەبوو
کەی بەر لەوەی پرچەکەی تۆ درێژ ببێ
پەلکەزێرِینەو بارانو شۆرِەبیو سەوزە گیا هەبوو

کەی بەر لەوەی منو تۆ عاشقی یەك بین
خورپەو خۆزگەو خەونو رِاچەنین هەبوو
کەی بەر لەوەی عەشق فێری ماچمان بکات
یەك دلۆپێ هەنگوین هەبوو

کەی بەر لەوەی کڵپەی عەشق بەرزبێتەوە
ئاگر هەبوو
کەی بەر لەوەی ئێمە یەکدیمان خۆشبوێ
شیعر هەبوو

هیچ شتێك بوونی نەبوو... سەراپای ئەم دونیایە
بەدلۆپێ عەشقی دلمان هاتە کایە...

# وڕێنەی
# سۆفییەکی گومڕا

وەها مەست مەست بووم بەشیعر

نازانم... بەفر

دەبارێ... یا ئاگر...

بەجۆرێك خەریکی سووتانم

نازانم نازانم

بارانە دەبارێ... یا ئەشکی چاوانم

بەجۆرێك من.... لەناو خۆمدا سەرگردانم

چووزانم

ئەوە هەورە دەگرمێنێ

یامناڵی شەهیدێکە لەبرساندا دەناڵێنێ...

ئەوەندە سەرقاڵی گریانە چاوانم

نازانم... نازانم

لافاوە هەڵساوە

یاخوێنی-زین- ێکی کوژراوە...

دڵمو خودا ئەوەندە لێکدی نزیکن

نازانم... نازانم... خودای مەزن

خودایە

یاخود... من...

لەگشت جێگاو ناجێگایەکدا دەتبینم

لەگشت ڕێگاو نارێگایەکدا دەتبینم

لەپشت هەموو دەرگاو نا دەرگایەکدا دەتبینم

لەناو هەموو چراو ناچرایەکدا دەتبینم

خوای میهرەبان من بەنووری تۆ گەشبینم

# مەستبوون
# بە عەشقی خودا

دەمەوێ هەر بەدمەست بمو دوور بم لەخەم
لەناو کەعبەدا هەڵدەم
پێکی یەکەمو سەدەم...

دەمەوێ بۆ دیداری خوای مەزن... راکەم
روو لەمەیخانەیەك دەکەم
من یەکەمین خواپەرستی ئەم سەدەیەم
روو لەبتخانەیەك دەکەم...

منم منم
لەلافاوی عەشقی خودادا ونم
منم ... منم
نەبەهەشتم لەخوا دەوێ
نەجەهەنم

منم... منم
لەبەر ئەوەی لێم تێناگەن
دۆستو دوژمنانی خودا
وەك یەك بوونەتە دوژمنم...

منم منم
هەموو گومڕاو باوەڕدارێك
شیر تیژ دەكا بۆ گەردنم

منم منم
هیچم لەخودا ناوێو
خەریكی خوا پەرستنم

منیش حەلاجێكی زیندووم
بەشمشێری عەشق ئەنجن ئەنجنم

منیش حەلاجێكی دیكەم
عاشقی خواو نوێژو ژنم

منیش حەلاجێكی گومناوم
خەیاڵدەكەم لەپایزدا گوڵ بچنم...

منم... منم
نە ژیانم كۆتایی دێ
نەمردنم

منم.. منم
ئەو رووبارەی خۆڵی دونیای تیا ڕۆبكەی
هەر ڕۆشنم...

منم منم
خودا بەرەو هەر کویێ بچێ
من لە ژێر پێیدا... شەونمم

منم... منم
چرکەیەك خوام لێ ون نابێ
بەبێداری و بەخەوتنم...

منم منم
هەمیشە خوا دەبینم
کەبیشخەوم دێتە خەونم

منم... من... من... منم...من...من
خودا وەکو ئەفرێنەری هەموو گەردوون دەپەرستم
نەوەك لەترسی مردن...

منم من من... منم من من
هەموو تۆزقاڵێکی گیانم
لێ ی دەبارێ ناوە جوانەکانی خوای مەزن
منم... من من... منم... منم
لەهەموو شتێکدا پارێزم
بەتەنها هەر لەعەشقی خوادا نەوسنم...

منم ... منم...
هەموو دونیام ورس و بێزار کردووە
بەبێ دەنگی و بەگوتنم...

# هاودژ

هەموومان

گوزەر دەکەین بەو شەقامەدا

لەسەر شۆستە خەواڵۆکەدا

لەگەڵ کچێ... دوانی جواندا

جارجار چاوبڕکێ دەکەین

هەندێکیشمان بۆ فیزیش بێ

جگەرەیە دوان پێدەکەین

سەرنجی ژنانی ئەودیوی

شووشەی تۆمبێلەکان دەدەین

هێندە دەزانین لەپڕ

لەناوباخی گشتی دا
بەژنو باڵاو سنگومەمكو قژو خەندەی
کچان دەبێ بەباخێ تر
بەمۆبایل کەپڵەکانیان
لەتووی مەلیکەوە بانگ دەکەن
شەقامەکە سواغ.. سواغ دەدەن
بەپێکەنین
شەقامەکە بۆیاغ دەکەن
بەراچەنین
پیاسەرکەوی... یاخود پیادا بێیتەخوارێ
نم..نم..خور خوڕ..نم..نم..نم
شیعرو ماچو بۆنی مەمکی پیا دەبارێ
چۆڕ..چۆڕ..نم..نم.. خوڕ.. خوڕ.. نم.. نم
سەرەتاپای شەقامی-سالم-

# ئەستێرە
# دیارو نادیارەکان

**ئاوی هەزاران دەریاو گۆم**
**بەشی ئەوە ناکات... نا**
**دەستنوێژێکی پێ بشۆم**
**بۆ تەوافی بتو بتخانەی یار بڕۆم**

**ئەو بەدوور و درێژی... باسی جوانیو**
**گەشی هەتاوی بۆ کردین**
**منیش پێم گوت ئێمە ئاشنای هەتاو نین**
**دونیای ئێمە تاریکییەکی خامۆشە**
**شارەکەمان بیابانێکی رەشپۆشە**
**بەچرایەك دڵمان خۆشە...**

**چەند بەدبەختە... بەر لەوەی**
**لەدایك بێو هێلانەکەی**
**پڕکات لەریقنەو جریوە**
**بەر لەفێربوونی خەندە**

بێ پرسی خۆی قەفەزێکیان بۆ چنیوە:
باڵندە

هەمیشە بەد گومانین
کەچۆن خۆشیو پەژارە
لێکدی جودا بکەینەوە...
نازانین....!

ئەسپێکی شێتو وێتەو هەر رادەکا
کەس ناتوانێ لغاوی کا...
کەس ناتوانێ پێی بڵێ نا
بۆ کوێ بڕواو بۆ کوێ نەڕوا
سنوورەکان وەکو گژوگیا دەخوا
هەمیشە بۆ لای یار دەڕوا
-با-

کە بەرێگایەکدا دەڕۆم
تەنیا نیم من
رێگاکە دەبەم لەگەڵ خۆم

کەپێکەنین باری لەچاوی زستان
لەماڵەکانی ئەو کێوە
سەرما گڕو دوو کەڵی لەخەو هەڵسان...

هەتاکو تۆم نەدەناسی
زەوی گوڵی تیادا نەبوو
هەتاکو تۆ خۆشمتنەویست
سنگم دڵی تیادا نەبوو...

# عەشق نایەڵێ
# دڵ پیر ببێ

لەهەر کوێ ناوت بنووسم
بەهار دەزێ و گوڵ دەڕوێ
لەهەر کوێ دەمت رامووسم
هەزاران کانی... دەپشکوێ

لەهەر کوێ بانگت کەم.... ئاسمان
پڕ دەبێ لە ئەستێرەی نوێ
کەتۆ پێدەکەنی جیهان
پڕ دمبێ لەپەنجەرەی نوێ...

لەوساوە کەتۆم خۆشدەوێ
هەتاو زووتر لەئاسماندا دەردەکەوێ
لەوساوە تۆ خۆشمتدەوێ
گوڵی زیاتر لەباخچەکاندا دەجلۆێ

لەوساوە ئێمە عاشقین
پەپوولە خۆی... بەگوڵدا هەڵواسیوە
بۆ شیرینکردنی هەنگوین
هەنگ ماچی ئێمەی دزیوە

بۆ زەردکردنی قژی خۆی
هەتاو لیسکی پێکەنینی تۆی چنیوە
تۆبۆ هەرچی شوێنێك بڕۆی
جێپێکانت دەریای مرواری و زیوە...

کەبەهار دێ ئەو گشت گوڵە
رەنگاو رەنگە... خەندەی تۆیە باریوە
پایزانیش ئەو هەموو لیرە زەرد زەردە
خۆزگەکانی دڵی منە... هەڵوەریوە...

من بەجۆرێك لەعەشقی تۆدا... ون ونم
لێم تێکچووە پرچە درێژەکەی تۆیە
یا گوریسی قەنارەیە... دێتە خەونم
دەئاڵێ لە... گەردنم...

هەمیشە نازانین و نازانین
لەبری ئەوەی...
خەمەکان تیرۆر بکەین
خەندەکان دەکوژین

بەم هاوینە لەسەرماندا هەڵدەلەرزن
بۆ....؟ نازانم
دایانپۆشە بەگڕی ماچ:
شیعرەکانم...

کە دوو دەم یەکدی دەمژن
لەسێبەری باڵایاندا
سەدان هەزار گوڵو پەپوولەی ڕەنگین
جوون جوون... چین چین
لەدایك دەبن...

هەموو شەوێك لەپاڵ خۆمدا
وێنەیەکت دروستدەکەم
بەوشەو تەم
زۆر دەترسم بەیانیانێك
لەپاڵما بتدۆزێتەوە
هاوسەرەکەم...

داستانی سەد عاشقی
ئەز بەر کردووە
هەموو
گوڵێك

## یاری شەترەنج

ئەمە حکوومەت نیە
پاشایەكو
دە دوازدە وەزیری شەترەنجە
هەوەستم بێ
هەمووی تەفرو توونا دەكەم
بەیەك پەنجە
* * *

# درووستکردنی
# ئەستێرە بەوشە

دهەزار ساڵە دەیناسم
بەکوردی لەدایکبووەو
هیچ زمانێکی دی نازانێ
جگەلە زمانی کوردی
رووباری:
ئاوەسپی

بەکوردی گۆرانی دەڵێ
لەئاسمانی.... خورماتوو
لەسەر ترۆپکی جەوەڵبۆر
بەیانیان زوو
کەلەدایك دەبێ:
خۆر

* * *

خوشکمانن... برامانن
ئەوانەی لەکەرکووك دەژین
بەیەکەوە دابەشدەکەین
خەندەو فرمێسکی ژیان
بەیەکەوە پێدەکەنین
بۆ ئەستێرەو خۆری بەیان
بەیەکەوە پرسەی شەهیدان دەگرین
بەیەکیشەوە دەچین
بۆ زەماوەندی زاواو بووك
گەورەو بچووك
بەڵام کوردەو جگەر گۆشەی کوردستانە:
کەرکووك

کەدەست دەکەنە ملی یەك
بەلەنجە دەڕۆن بۆ پیاسە
سروودی- ئەی رەقیب- دەڵێن:
قەڵای کەرکووکو
زێی خاسە

رەنگە بەفر رۆژێ ببێ بەپەموو
رەنگە رۆژێ ئاڵتوون ببێ بەڕەژوو

ڕەنگە ڕۆژێ دار بی ببێ بەدارتوو
بەڵام کوردەو پارچەیەکە لە کوردستان
نابێ بەعارەب و تورکمان
دووزخورماتوو

سوێندی خواردووە بەکردگار
هەتا شوێن پێی داگیرکار
دیاربێ لە سەر خاکی کفری
هەر یاخی یەو نایەتەخوار
برایم خان لەو لووتکەیەی
باوەشاسوار

گەر خۆر هەڵنەیەت بەر بەیان
ئەستێرە نەمێنێ لەئاسمان
چی دەریایە هەمووی ببێ بە بیابان
گوڵەباخ ببێ بەخڕنووک
کوردستانەو هەر کوردستانە:
کەرکووک

ئەو ئاوەی کە قوڵپ قوڵپو گرێ گرێ
بەخاسەدا تێدەپەڕێ
ئاو نیە... خوێنە
خوێنی محەمەد شەربەتچیو
خوێنی شێرزاد جەباریو
شێخ مارفو شێخ حوسێنە

**تیژە بیری منداڵێتیم**
**بەهەردوو چاوی خۆم بینیم**
**دیوانی مەلای جەباری‌و**
**شێخ رەزای تاڵەبانی‌و**
**سابیری‌و**
**ئەسیری‌و**
**لوتفی**
**لای محەمەد ئەمین عسری**
**دەکڕی**
**باوەشی پڕ بوو لەپەڕتووک**
**دەیگووت هەر کوردی دەزانم؛**
**قەڵای کەرکووک**

# قاچاخچی

بەرپرسێکی گەورە... گەورە

خۆی بەتەنیا

بۆ گەشتێکی تایبەتی چوو

بۆ رۆمانیا

لەرێ کاتێ پشکنییان

چاڵە نەوتێکی گەورەیان

دۆزییەوە... لەگیرفانیا

# چوار خەونی نەبینراو

بشێ لەو دەشتو کێوانە
هەست بەجوان گوڵ بکات،
ڕێوی

لەدووشتدا زۆر بەهرەمەندە
زۆر... زۆر
یەکەم: درۆ
دووەم: درۆ:
دکتاتۆر

سەیرە... بەزستان گەرمایەتی
خۆی ڕووت ڕووت دەکاتەوە،
درەخت

هەزار ساڵ بژێ
هەرگیز... هەرگیز
ددانی نایەشێ
چونکە ددانی نیە:
پەپوولە

# بەراورد و
# شتی دیکە

گورگێکی برسی

یوسفی دی

نەی خوارد لەبەر منداڵێتی

براکانی توورِیان دایە بیرێکەوە

لەو دوورگەیە

ئیتر مرۆڤ بۆ دەڵێن گورگ:

درِندەیە

هەندێ کەس بەزیندوێتی
بۆگەنیان کردووەو مردوون
هەندێ کەسیش
هەموو ڕۆژێ بیانکوژی
هەر زیندوونو؛
زیندوون

گەمارۆی داوین مەترسی
باخچەکانمانی پەژموردەکرد
شەڕی ڕەنگەکان بۆ؛
کورسی

# زیندەگانی نامەی کەرکووك... و مەرگنامەی داگیرکەران

جاران هەموو ڕێگاکان
دەچوون بۆ:
بانە
ئێستا گشت ڕێگاکان
دەڕۆن بۆ:
ماڵی مامە ریشە... لە
کەرکووك

ئەگەر خوای مەزن
بچوایە بۆ میوانی خۆشەویستانی خۆی
دەچوو بۆ ماڵی
ئازاد هەورامی لە
کەرکوك

ماڵی کەس... نیە کەس کەس
تاپۆکەی لەگیرفانی
کامیلی مەلا وەیسی دایە
کەرکووک

خوای مەزن
سێ جار گریاوە
یەکەم جار بۆ:
هەڵەبجەی کیمیابارانکراو
دووەم جار بۆ:
ئەنفال کراوەکان
سێیەم جار بۆ:
ئاوارەکانی کەرکووک

خوای مەزنیش
بەکوردی قسە دەکات
کاتێ کەدەچێ بۆ:
کەرکوک

خوا ئەگەر
لە ئاسمان بێزار ببێ
بەجبرەئیل دەڵێ
عەرشەکەی بۆ بگوێزێتەوە:
بۆ کەرکووک

هێشتا تنووك... تنووك
بۆنی خوێنی ئەرپەیان لێ هەڵدەقوڵێ
شەقامەکانی:
کەرکووك...

خوای مەزن
دووجار نەفرەتی کردووە
یەکەم جار لەئیبلیس
دووەم جار لە:
بەرپرسەکانی
کەرکووك

لە:
حزبو مزب بێزارە... بێزار... بێزار
تەنهاو تەنها
ناسنامەی کوردستانی لەگیرفاندایە
کەرکووك

هەموو بڵێسە ئاگرێك
شەهیدێکە بەچرایەکەوە
بۆ ماڵەکەی جارانی خۆیان دەگەڕێ لە:
کەرکووك

لە ژمارەی هەموو نەتەوەکانی عێراق
زۆرترن... زۆرترن... زۆرتر
ژمارەی شەهیدانی کوردی؛
کەرکووک

ئەگەر دەمی ببوایە
تفی لەهەمو بەرپرسێکی
نەوت دز دەکرد
کەرکووک...

ئەگەر خوای مەزن
حەزی لەگۆرانی بوایە
دەچوو گوێی لەگۆرانی یەکانی
عەلی مەردان دەگرت.. لە؛
کەرکەووک...

لەباو باپیرانمم بیستووە
مردوو زیندوو بۆتەوە
کەشۆردراوە بەئاوی:
کەرکووک.

لەهەموو ئەستێرەکان
جوانترن ئەستێرەی ئاسمانی
کەرکووک

**ئادەمو حەوا**
**کەلە بەهەشت دەرکران**
**چوون بۆ:**
**کەرکووك**

**وا ڕاهاتووین**
**کەدەبین بەوێنەکێش**
**سەرەتا لەسەر دڵماندا**
**دەکێشین وێنەی:**
**کەرکووك**

**لەو چیاو گردۆڵکانەدا**
**گوێم لەدەنگی هەزاران شەهیدە دەڵێن:**
**ئێسکو برووسکەکانمان ببەنەوە بۆ:**
**کەرکووك...**

**بەزیندوێتی و بەمردوێتی**
**هەر شەهیدن**
**شەهیدن**
**کوردی:**
**کەرکووك**

**وڵاتی بەرپرسە بازرگانەکان نیە**
**وڵاتی شەهیدەکانە**
**شەهیدەکان**
**کەرکووك**

دەكرێ ناوی شەقامەكانی
بگۆڕدرێ
بەڵام ناكرێ
ناكرێ
لەیاد بچێ ناوی شەهیدێكی
كەركووك

زستانان كە ئاوی خاسە هاژەی دێ
ئاو نیە
خوێنی شەهیدەكانە
گۆرانی دەڵێ بۆ،
كەركووك

خوای مەزن
كە گوڵە سوورەكانی درووستكرد
پێی گوتن... سوور بن... سوور بن سوور
وەك زامی شەهیدەكانی
كەركووك

# چراکانی ماڵی خودا

که سەرنجی دەدەمێ
لە ئاوێنەی ئاسماندا
وێنەی تۆ دەکێشێ :
هەور ...

لە جوغزی بیاباندا
وەك گوڵ
ناز دەکات :
دڕك ...

ژمارەیان  لە ژمارەی گوڵەکانی
بەهار
زۆرترە :
شەهیدەکان

ئەگەر عاشق نەبێ
چۆن لەو بەرزاییەوە خۆی دەخاتە
خ
و
ا
ر
ێ
تاڤگە ...

رووت بەرەوە ... رووت بەرەوە
کوتوپڕ
بائیتر
بە سپێتی خۆیەوە نەنازێ
بەفر
* * *
هەزار پاڵەوانی خەسان :
نەوت
هەزار شۆڕش گێڕی کرد بە بازرگان :
نەوت ...
هەزاران عاشقی نیشتیمانی
کرد بەکۆیلەی دوژمنان :
نەوت ...

# وشەکان
# بەبێ باڵ دەفڕن

ڕەشەبایەك ... بەڕێوەیە
وا ماڵئاوایی دەکەن لە لق و
چڵ :
گەڵاو
گوڵ ...

روحی شەهیدەکانمانن
لە ئاسماندا
بوون بە
ئەستێرە ...

بووە بە زێوانی کڵێسا
هەر زەنگ لێدەدا :
هەور ...
بە مەمکەوە جوانە :
ستیان ...

ژێ ی کەمانجە و
تاڵەکانی پرچت
لێکدی دەچن
جیاوازیەکەیان ئەوەیە
ژێی کەمانجە ئاوازی لێ دەباری
پرچەکەت : جێ پەنجەی
من ....

* * *

کچان سومبولی بەرگرین لە بالندە
هەمیشە لەسەر سنگیاندا
یاری دەکەن :
دوو کۆتر

دوو کۆتری ئاشتیخوازن
هەزار گازیان لێ بگرم
دەنووکێکم لێ نادەن :
مەمکەکانت ...

بە ڕامبۆ بڵێن :
لێرە هەموو ژیان بووە بە :
وەرزێك لە دۆزەخ
ئاگر خۆڵەمێشی دەبێ
عەشق :
ئاگر ...

لە هەموو دەریاکانی جیهان
نەمرترە
دەریاچەکەی :
لامەرتین ...

کەس نازانێ بۆ هەموو لیرەکانی خۆی ریز ریز
بە ڕەشەباکان دەبەخشێ :
پایز ...

رووبار
ئەسپی شەپۆلەکان
بار دەکات لە ماسی :
بەهار

خەو دەبینم
خەوی رەنگین
بەخەو بینین
تاڵێ لە پرچی گشت کچێ
دەدزم و بۆ خۆم دەیکەم :
بەسەرین ...

دوو تۆپەڵ بەنی رەنگاو رەنگن
بەلام کاتێ لە پێیان دەکات
کچێك
دەبن بە دوو دەریای مرواری :
گۆرەوی ...

ئەو شێرانەی کە منداڵەکان
درووستیان کرد لە بەفر
کتوپڕ
لە ترسی هەتاو :
بوون بە ئاو ...

کە لە دایکی توورەبوو
لە لووتکەیەکی بەرزەوە
خۆی هەڵدایە
شیوێکەوە :
تافگەیەك ...

# ون بوون لە رووناکایی لووتکەی عەشقدا

دڵم وەها تێکەڵاوی ئاگری عەشقی خودایە
خەم و شادی هەردوووی یەکسانن لای من
عەشقی دڵم لەتاریکی رێگاکاندا چرایە
رووناکی خۆی لە دڵمدا چاندووە خودای مەزن

کە عاشقم من دڵم بە نووری خودا رووناکە
کە نووری خوام هەیە من دڵم لە تاریکی بێ باکە
کە شەو بۆ بەردەرگای بتخانەکەی یار دەڕۆم
هەموو تۆزقاڵێکی جەستەم لە پڕ دەبێ بە مۆم

بە عەشقی یار من هەزاران باڵ و شاباڵم هەیە
لە هەر هەموو دڵێکدا من ماڵ و رەشماڵم هەیە
پادشایەکی نەناسراوم لای یار بەجێماوە تاجم
نەخودام و نە پێغەمبەر من دووەمین حەلاجم

بە فرمێسکم ئاو دەدەم بێستانی یار
دڵم سیخناخ سیخناخە لەخەندەی لێوانی یار
رۆحم هەمیشە تۆزقاڵێ گڕی خەندەی یاری پێ یە
بلیتم لەگیرفاندایە من شەو دەڕۆم بۆ ژوانی یار
پێکی خەندەی لێوی یارم رووناکی ئاسۆ و زەمینە
یار خودایەیار بینراو و نەبینراوە یار دیار و نادیارە
دڵم جگە لە عەشقی یار خاڵی یە لە هەموو شتێك
بە رۆژ هەتاوی دڵمە یار ... ئەستێرە و مانگە ئێوارە

ئەم ڕێگایە
جێ پێی پیاسەی من‌وتۆ
بست بست درووستی کردووەو
لێرەوە... دەگاتە
ئەو پەڕی ئەم دونیایە
ئەم رێگایە
لە ژێر پێماندا نیە
لەئەتڵەسی دڵماندایە
ئەم رێگایە
هەور زستان... پیاسەی بەسەردا دەکات
شووشە عەتری پیا دەڕژێنێ
هەتاویش دێ شەتڵی گوڵی تیا دەچێنێ
ئەم رێگایە
لەدڵمەوە دەست پێدەکا
لەدڵتا کۆتایی دێ
ئەم رێگایە
لەدڵتەوە سەرهەڵدادات
لەدڵمدا لەنگەر دەگرێ...
ئەم رێگایە
درێژترین شەمەندەفەری دونیایە...